ناوی کتێب: سەراپام  خەونە
ناوی نوسەر: ئالان پەری
بابەت: شیعر
تایپ: نووسەر
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولرەحمان
سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد رەفیق
ژمارەی سپاردن: ١٢٠٦ ی ٢٠٠٩
تیراژ:٥٠٠ دانە
نرخ: ٢٥٠٠ دینار
چاپی یەکەم  ٢٠٠٩ سلێمانی

# بەبیرهێناوەیەک

لە سەربانی گڵی منداڵیی
بۆ ناو کۆڵانە تەسکەکانی (گاوران)*
لە باخچە ئەبەدییەکەی باپیرم و
لەدرووستکردنی شەرابی مەستیی بۆ خەڵکانی عاشق
هەتا بۆنی قژی کیژەکانی شار
من وازییەکان ، و پیاسە تەنیاییەکان ،
هاتووچۆکانی کەونێک لە تامەزرۆ بۆ
سەندنی ماچێکی ئەوسا لە یاد ناکەم

من لێرەوە ، لەم چەقی دوورییە ...
دان بە بەجێهێشتنی ئێوە دەنێم
و دوا دیمەنی ماڵئاواییەکەم لە یاد ناچێ ...
بڕیارە بێمەوە لاتان ..
شیعرم باڵی هەورێکی سپییە
گەرووم دەنگێکی یاساغە
دڵم لەسەر مشتم ، چاوم بۆ خەوی ئێوە ناخەوێ .

*(گاوران) گەڕەکێکی کۆنی شاری سلێمانییە و شوێنی مناڵیی شاعیرە .

# لەبری پێشەکی

له مێژه پیاسەكانی تەنهاییم گۆڕیوەتەوه به وێنەكانی شیعر، زۆر دەمێكه كاتی جەنجاڵی و مەودای كەوتنم ، به ساتی نوسین و فڕین گرێ داوه.

ئەم كۆ شیعره چەند پۆلێكن له فڕینی من به ئاسمانێكی تر ، چەند ناونیشانێكن له ئالانی گەردنی گەردوونێكی تر ، هاوار و قاقا ی چەند سەدەیەكه لەم چەند ساڵەی من دێته دەرەوه.

لەو بڕوایەی من كه ئەو جۆره هەستانه نابێ و ناكرێ خەفه بكرێن ، نابێ لەژێر گڵی كارەساتی ژیانم بنێژرێن .. ناكرێ متمانه بەو جێگایه بكەم كه هەست و نوسین و وێنەكانم بۆ بپارێزێ .... ئەشێ كه بدرێته چاپ لای

خوێنەر بپارێزرێ و لەباوش بکرێ و لەوانەشە فڕێ بدرێ بدڕێنرێ . بە هەر چۆنێک بێت ئەو بەشانەم ببینرێن و لە لەت لەت بونیان بگەمە ئەو ئەنجامەی کە بەشێکم لەو کەرتبوونەی جیهان .

چامەکانی ئەم کۆ شیعرە لە یادگاریدا خنکاون ، لە هەڵبەزین کەوتوون ، بەڵام نوسینی دەهرێکن لە کۆبونەوەکانم لە گەل ژیان ،جیهان ، ژن ، زەوی.

کارەساتە نووسەر بیت و لە هەمان کات دا وەک ئەوانی تر بژیت مەرگەساتە ئەگەر شاعیر بیت و لە هەمان ڕێکەوت دا وەک ئەوانی تر بژیت.

لێرە مەبستم لە جیاکردن و پۆلێن کردنی مرۆڤەکان نییە و بە شان وباڵی نوخبەکانیش هەڵنادەم ،ئەوەی مەبەستمە ئاستەمە ئەو دوو بەشەی ناو ناخی خۆت یەک خەیت بەشێکیان وشە نووس و هەست فڕین بێ و بەشەکەی تر تێکەڵ بە سادەیی بە ژیانی ئاسایی بیت... ئەو دوو جیهانە هەمیشە دەمخاتە مەترسییەکی ئێجگار قوڵەوە کە کامیان بەسەر کامیان دەبێتە پێشەنگ لە ژیانی خۆم دا .

به لای من نوسین ئازارێکی ڕۆژانەیە دەنکە حەبێکی ئازاربەخشە بۆ حەسانەوەی جەستە و بیرو هۆش.
بۆیە ئەکرێ ئەم کۆ شیعرە چەند حەبێکی ئازار بەخش بن لە دژی چاک بوونەوەم لەم جیهانە نەخۆشە.
شاعیر لە زمانێک ئەتۆرێ ؟ شاعیر لە مێژووی نوسینی خۆی پاشگەز دەبێتەوە ؟ من سەردەمانێک بە زمانێکی تر ــ (عەرەبی) هەستم ئەنووسی و خاوەنی ٣ بەچکە کۆتری شیعریم لە ڕەحمی ئەو زمانە. زمانێکی تر و ڕەنگێکی تر بەڵام بە ڕۆحێکی کوردی تر . پێش ئەوکاتە و هەر لەوکاتەوە... زۆر دەمێکە هەوڵی ئەوەم داوە بە زمانی گەردی (کوردی) بنوسم ، بە وشەی شاخ و دۆڵی سەوزی (کوردی) بنووسم هاتمەوە سەر ڕێی ئەو زمانەی بۆ نمونە (نالی) و (گۆران) و (شێرکۆ بێکەس) پێی مەستن.
ئەم کۆشیعرە لە هەناسەکانی ساڵی ٢٠٠٠ و تا پێش دوا ساتەکانی ٢٠٠٨ دا نوسراون و تەنها چامەی کۆتایی نەبێ کە لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠٩ نووسیومە و هەموو چامەکان بە پێی بەرواری نوسینیان بەڕیز ڕێکم خستون، بەو بڕوایەی من کە بەرواری نوسینی هەر هەستێک تۆمارکردنی

داستانێکی شیعرییە لە سەر کات و مێژوو و ئەو خاکەی کەلەسەری نوسراوە ، بۆیە بەروار و ساڵ و شوێنی نوسینەکانیشم فەرامۆش نەکردووە ، وا هەست دەکەم ئەوانەش بەشێکن لە هەر شیعرێک و دواجار بەشێکن لە ناخی هەستی خۆم.

لەم کۆ شیعرە ئەشێ بەیاننامەی لێبوردن بێت بۆ چەند کەسێ و ئەشێ هەڵکوڵینی چەند هەست و یادگارییەک بێت بۆ چەند کەسانێکی تر، ئەشێ جاڕنامەی شیعرێکی یاخی و سەرکێشی و نا ئومێدی بێت و ئەشێ وەسیەتی چەند پەڕەیەکی بۆر و کەڕوو بێتن لە وشە.

ئالان پەری
بانفلۆین ــ کۆپنهاگن
٢٠٠٨/٠٦/١٥

جوانییەک هەیە لە نێو هەورە سپییەکان ونە

هێمنییەک بەدی دەکرێ  لە ناو بێدەنگیی ئاو دا پڕ دەنگە.

# چی دەبەخشی..؟؟

چی دەبەخشیتە شێتیم ؟؟
وا دەنوکی کۆترەکان ، بە سەر و قژی منەوە سەرقاڵن..
چی دەبەخشیتە هێمنیم ؟؟
وا دەریاکان بە شەپۆلەکانیان ،بەسەر جەستەمەوە زاووزێدەکەن

من ئاواتێکی ڕەشم بۆ بارانێکی ژێر ئاسمان
من کڵپەیەکی کوژاوەی ئەم ئەشکەوتەم

تەنها تۆ ئەمبەخشی ...
تۆ ئەتوانی ماچێک لەسەر لێوم مینرێژ بکەی
ئەتوانی بەخەندەکانت...
ڕۆژە تاریکەکان سەر لەنوێ ڕوناک بکەیتەوە
تۆ ئەتوانی دەستم بگریت و ...
ئەم جیهانە لەبار چووە بهێنیتە پێکەنین...
کاتێک باوی هەناسەدان نامێنێ
باوی گوشینی دەست نامێنێ...
ئیتر نامێنێ  بە یادی چاوی جاران یەکتری ببینین
من و تۆ هەر بەو چرپانە یەکتری ئەناسینەوە کە
بە بێدەنگی دەیبەخشینە یەکتر .

٢٠٠٠/١١/٠٨
تشیابۆرگ

# ئایەتە ڕەشەکانی (با)

کاسەیەک لە خۆری سبەینێ و
فرمێسکێکی تەنیا
چەند یادگارییەکی لابەلا و
ڕەشەبایەک ، میوانی ژوانی ڕۆژانەیە
ماچەکان لە لێوی من و نەورەسەکان دەدزن
خاچەکان لەسەر سنوری دار سنەوبەرەکان
بە بارمتە دەگیرێن
ئازارەکان دەگوشرێن

تەنیا عەشقێک بە هەموو ئاوازێکی ئەم چامە
دوکەڵاوییە
دەکەوێتە سەما
عەشقێک تازە لە دڵی زەردەخەنە لەدایک دەبێ
و هەر تازەش دەگاتە لای هەوەسی جەلادێک

دەنگەکان دەوەستن
هەناسەکان سواری یەکتری دەبن
ڕازێک ، دڵ لە مۆمیا دەدا
دۆخی شیعرێ دەگەڕێتەوە
بۆ لای خوێنەری ئایەتە ڕەشەکانی (با)

٢٠٠٠/١١/١٨
تشیابۆرگ

نە دڵۆپی خۆر وشک بووە سەر ڕوومەتم

نە خوێنی شارەکان لە شۆستەی کوشتنم قەتیس بوو.

# مەرگ بۆ ٣/١٦ دەگێڕین

ئاهەنگی مەرگ دەگێڕین
پێش مردنی درەختەکان
و داوی پشت تێکردنی مانگ لە ئەستێرەکان
مەرگ بەو لەزەتە بەجێماوەی سەر لێومان
دەگێڕین
بەو تاریکییە پڕ تاوانەی کە باوەشەکانمانی سارد و
وێران کرد

ئێمە هەر مەرگ دەگێڕین
سەیری ملی ئاسمان دەکەین

چاوەڕێی ئەجەلی لەرزینمان دەکەین
چاوەڕێی کەوتنمان دەکەین لە سەر سەکۆی
سەماکە
ئێمە لەوێ ئاهەنگی مەرگ دەگێڕین
ئەوێ......
خوار مردن و سەروو ژیان
بە سەمای منداڵەکان بزماری تابوتەکان بە ئێمە
دەفرۆشین

هەر بەدەم مەرگی ئەو ئاهەنگەوە
کەللە سەرەکان لە کونی دوکەڵەوە دەرکەوتن
ئاسمان قسەیەکی نەکرد
منداڵەکان بەرەو ماڵی مەرگ بە ڕێکەوتن
دونیا ورتەیەکی لێوەنەهات

٢٠٠٥/٠٣/١٦
**ڤایین**

# بۆ هاتی ؟؟؟

چەند ئاستەمە بگەڕێیتەوە
ئازارەکانت لە ئازارەکانی سەفەر بچێ
شێوەت بەقەد داری سنەوبەر کۆن و پڕ تۆز بێ
سەرت بۆ پیریی بەفر لەق کردبێ
ئاستەمە بگەڕێتەوە و
کیژانی شاریش بەهەلهەلە سوتاوەکانیان
بێنە پێشوازیت...
پیاوانی گەڕەکیش لەجەستەت مێژووێکت
لێبسەندنەوە

چەند ئاستەمە بگەڕێیتەوە

دوا ساتەکانی وەرزی گوڵ ببینی
تامی هەموو بارانی گریان بکەی
دەمووچاوەکان وەک جاران لێت نەڕوانن
لێوەکان لە ترسی گوێدانە ئەم و ئەو بۆ یەکتری
نەخوێنن
ئاستەمە بگەڕێیتەوە
پرسیارە باوەکانت لێ بکەن
_بۆ هاتی ؟
کاتێک ئاو لە مناڵیی وشەکان دەخنکێنرێ
_بۆ هاتی ؟
کاتێک پێڵاوەکان بەسەر یاسای ڕۆیشتن نارۆن
_بۆ هاتی ؟؟
_ هاتی بۆ ئەوەی لەگەڵ خانمەکەت لەسێدارە
بدرێیت ؟؟
ئەو خانمەی کە سینەی
هەپروون هەپروونیان کرد
و بووە مۆڵگەی شەمشەمە کوێرەکان...؟

_بۆ هاتی ؟

بۆ ئەوەی تاوانبارت بکەن ؟

کاتێک هەموو زەوی لە باسەکانت وەڕس بووە

_لەم پایزە بۆ هاتی ؟

کاتێک هەوا لە دارستانەکان بێزارە و

خۆرەکان لە ڕەحمەتی نور تۆراوە

_بۆ هاتی ؟

_ تۆ بۆ هاتی؟

٢٠٠٥/٠٣/١٦

**ڤایین**

# شاری لەرینەوە

شار پڕە لە شتی باو
تێرە  لە نەزۆکیی
شار لە هەنگاوەکانی دەریا و
شەلەشەلی ئاو تێنگات
شار فێرە لە مردنی گۆرانیەکان
شار.... شار
لە لەرینەوەی زەوی و
لە پەلەپەلی داماڵین ژیر نابێت

٢٠٠٥/٠٣/٢٥
ڤایین

# هێڵی ئاسۆی جاران

ئێستاش نەسیمی ئەو بەهارە سەوزە
بە لای شانی زستانیم تێئەپەڕێ
ئێستاش نیگای ئەو خۆرەم لەیادە
کە لە سەر پردی هەڵهاتنەوە سەمای
بۆ بەیانییەکی پڕ لەجریوە دەکرد

چەند لە ناخمدایە ئەو بایەی ئەوین ..
کە لە برسێتی نیگایەک هەڵئەکا و
لە تێربوونی ماچێک هێور دەبێتەوە
ئێستاش ئەو هێڵە ئاسۆیەیی جاران ماوە
کە بۆ ئێواران سێبەرە و بۆ ئاسمان هەورە
بۆ خاک ڕەگە و بۆ دڵ مشتێکە لە یادگاری

ئێسپییە ٢٠٠٥/٠٤/١٢

# بەمردن فڕین

وەک خۆرێکی هەتیوی ئەم گەردونە
کەوتینە پۆشینی ئەو هاوارە لە ڕووناکی
وەک دەریایەکی ماندووی ئەم ئۆقیانوسە
کەوتیە خنکاندنی تەڕایی ئاو

لەبەردەم ئاوێنەکانی جەنگ
ورد ورد شکاینە سەر ئەشکەنجەیی فڕین
فڕین.........
فڕین،،،،،،،،،،،
بەمردن بەرەو بێ دەنگی فڕین

٢٠٠٥/٠٤/٢٨
**ئێسپییە**

# نەمانی عیشق

هەرچەندم کرد نەم توانی ئەو هەنسکە..

لە سەرچاوی تەمەن لابدەم....

نەمتوانی ئاسەواری ئەو خوێنە لەجەستەی،...

خۆم و دیوارەکانی شە کەت بسڕمەوە...

نەم توانی ئەوهاوارەی ناخم.....

لەترسی درۆی سبەینێ بوەستێنم...

سبەینێ...

ئەوکاتەی ئاو لە دەنگی خۆی دەکەوێ و..

خۆریش موچوڕکەکانی ڕوناکی دەسوتێنێ...

لەوکاتانەدا...

وشەکان دەیان بەستێ و...

دڵی گەنجی ناوکۆڵانەکانی عیشق دەوەستێت.

٢٠٠٥/٠٥/١٤

**ئێسپییە**

# بڕیار

ئەمشەو بە پێویستم زانی کە ڕێگاکان
بخەمە سەر کۆشم و...
ڕوناکی مانگ بخەمە سەرشان و ...
بەرەو دورگەیەکی نادیار بڕۆم..
زۆر بە پێوستم زانی ...
کە ناوی ئەوین لەخاکی یاخی بوون..
هەڵکەنم و ...
بەقەد قەبارەی ئاو..
خۆم نوقم بکەم..!!
بەپێویستم زانی....
کەلە ژێر هەتاوێک بنێژرێم..

تیشکی بێ هودەیی لێ نەتکێ و
خەمی ڕەشەباکان نەیشێوێنێ..
ئەمە بڕیاری ئاسمانە و
پەیمانی شەوە شەرابییەکانی شیعرمە.

٢٠٠٥/٠٦/٣٠
ئێسپییە

# بۆ هاوڕێیەک

هاورێ...
ئەو شەپۆلانە دروست بکەرەوە
کەلەناخی دەریاوە دێنە قسە و
لەمەرگەساتی ئاو دەپژمێن....

هاورێ....
من و تۆ ئەم ئێوارەیە خاوەنی دەریاین...
خاوەنی ڕۆخەکانی نەمریی ئەو لمەین.....
تۆ ئەوەندە دوورمەکەرەوە
با ئەو (با)یە لەتروسکایی شەوێکی بێ گوناها
هەڵبێ...

با ئەو سەمایە بەبۆنی خۆر جۆش ببێ..
با ئەو ئاڵانی دوو دەستەی کە ئاوێتەی خەمە
بە ئاشتی بناسرێ .
تۆ دوورمەکەرەوە..
با لە ئەستێرە چرای شیعر بتنوسم
هاورِێ....
تۆ ئەو هاورِێیە نیت کە گوڵ سیس بێت تۆش
بۆنم نەکەیت..
تۆ ئەو کەمە سۆزەی بەفر نیت کەبەهار بێت
خۆت لەمن زیز کەیت..

هاورِێ...
ئەو یادگارییانە بە رِۆژی رِوناک مەسوتێنە،
با کەمێک لەژێر تاریکی نهێنی بیانبەستێ..
هاورِێ ئەو ئاوێنانەی ئاسمان مەشکێنە
با تاسەی سەرمان رِووت بێ لە درۆ و ونبێ
لەرِاستی

هاورێ ؟ ڕاستی ...
با ساتێک لەژێر ئامێزی ڕاستیدا گەردوون و
دوورگە ون بووەکانی ناخمان فێری دۆزینەوەیان
بکەین
با فلامینگۆکانی رۆحمان لە نەفڕینیان
فێری مانەوەی یەکجارییان بکەین
هـ
ا
و
ڕ
ێ
..........
..
.

٢٠٠٥/٠٧/٠٦
ئێسپییە

# کیژێکی ڕەش پۆش

قاچە برۆنزییەکانی هەر لە ڕۆخی لم دەچوون
دانیشتنەکەی لە ئەستێرەیەکی ماندوو  و هیلاک ،
بەدەست ئاسمانێکی پڕ لە دوکەڵ و تۆخ وەک
ترس
دەردەکەوت ...
دیار بوو ئێستا لە کەنار دەریای شەکەت
هاتبووەوە ...
ڕەنگی چاوەکانی  لە شینیی دۆلفینە پاشماوەکانی
لافاو دزیبوو ...
بە شێوەیەک پێ دەکەنی قاقای نەدەگەیشتە هیچ
نزیکییەک ...
دەستی.. مەچەکی.. ڕومەتی.. گەردنی.. مەمکی..

کتێبەکەی بن دەستی.. هەموو ئەوانە خەمیان
لێئەتکا...
هەنسکی دوودڵییان لێ ئەڕژا
.....
لەودیو خەونی بەهار
کیژێکی ڕەش پۆش بەخوماریی زامەکان،
کتێبی هەرەس هێنانی وڵاتێکی بێ باکی
دەخوێنێتەوە:
لەودیو ڕۆشنایی مانگێکی دیل بە شەو...
شەو لە مەست بونی خۆی ئەگەڕایەوە
لاوەکان دەست بازی شەوەزەنگیان
لەبیرچووبووەوە...
پیرەکان.... سپی.. سپی.. سپی ئەکوژانەوە...
ڕێگاکانیش لەڕێبواران دەبەسترانەوە....

٢٠٠٥/٠٧/١٥
برامین

## بەرالی ٨

شۆستە ساردەکانی شەو
دەنگی بێ ئارامیی ماچ
ئاوازی خنکاوی دەریاکان

بەقەد ڕەنگی (شیللک) بۆنی هاتنەوەی لێ دەهات
بەقەد گەروی تەڕی قامیشی (پانفلوت)ەکان
خۆشەویستی لێ ئەتکا..
...
دەردەسەریی ڕۆژگارەکان
ماندویی لاشەکان بەسەر هەنسکی جەنگ
ترسی ئاوێنەکان لە دوارۆژی دەموو چاوەکان

بەئاستەم نزاكانی دەگەیشتنە مەلەكوتی (با)كان...
بەئاستەم زەنگی فڕینی خەونەكان لەباڵە سپیەكانی دەزرینگا...
...
دڵۆپە سوتاوی هەتاو
شیلەی هەورە پەشمەكیەكان
سورمەی سەر سینگی خەونەكان

بەقەد هەناسەكانی خاك متمانەی دەبەخشییە گیانی مرۆیمان..
بەقەد تەوژمی گیا و تێكەڵ بە باران...
ئومێدی مزگێنییەكانی یەك بوونی جیهان ی دەدایە بەر گوێمان..

...
چاوە كزەكانی لە چەرچەفی ئاسمانا ڕاخرابوون

ڕوخساره سپییەکەی لە حەوشەی ماڵدا شۆڕابوو

بەقەد ئەسرینی قەتره شەرابییەکان..
خوماری عەشقێکی بابردوی دەڕشت...

بەقەد سێبەری دەنگ
بەقەد  ئاویی ئاو
بەقەد هەناسەی ڕەنگ
تا دەهات شەهوەتی ژین و لەزەتی مردن
 بۆ گەردوون جوان دەکرد.

٢٠٠٥/٠٧/٢٠
**ئێسپییە**

# نانسی (فلوت) *

*پێشکەشە بەو کیژە یاخییەی سەر ڕۆحم.....،*
*بەو یادە جوانەی پەیمانگا.*

(١)

باران لەشێتی ڕەشەبا بکەرەوە ...
ئەم سەوزاییە زۆر لەتینی گڵ ئەچێت
وەرز لەدوای وەرز پاڵتۆ خۆڵەمێشەکان لەخۆت بکەرەوە
و ...
هەناسەیەک بۆ پەپولەکانی تەمەن هەڵمژە ..
با ڕەشەبا ئەو پەنجانەت لەڕەگی ئاودا نەتوێنێتەوە ،،
با ئەو پرچە زیوییەت لەگڕی گەردونا
نە سوتێتەوە .....

دەبا تۆ ئەو شەوگارانە بیت کە لە پێناوی تۆ
مانگ خۆی ون بکا و ..
تۆ ئەو سیما ئازادە و ئازیزە بیت
کە خەڵکانی سەر زەوی
هەزارەها هەڕەشەنامەی جەنگ لە پێناوت ببەستن .

(٢)

خۆت لە دیوارەکانی هەناسەی ڕەشی زستان مەنوسێنە و
لەگەڵ بۆنی خۆر ونبە ، لەباڵای دارێکی پڕبەر دا
بحەسێرەوە
تەوژمێک لە یاسەمینی ماچ ، بۆ شەقامە چۆڵەکانی
خۆشەویستی هەڵکە......
تۆ....!!
تۆ لەو ویستگەیەی کەقەت باران تەڕی ناکات چاوەڕێم
مەکە !
تۆ لەو چیمەنەی کەسپییێتی بەفر دەرونی زەردکردووە
مەڕوێرەوە !
لەوێ....، لای خۆت،

ناخی دووریت بچەقێنەرە سەر ڕومەتی خاکێکی مەستانە
لەوێ..... بەڵکو باوەشەکانت بەرخەونێکی دروست بوو
بکەون
تۆ لەوێ لەسەر هێڵە تەریبەکانی
ئاسمان بەزەوی و
لەنێو هەتیویی مرۆڤەکان بۆ ئەڤینداری ..
نزاکانت لە ئەفسانە دەرکەو ئومێدێ ببەخشە بە سەراب
..
تۆ لای خۆت ...
دڵۆپێ خوێن بپرژێنە بۆ نێو دەمی شەرابخۆرانی پیریی .

(٣)

ئەمە ژیانێکی نەمرە لە نووسین
خەوێکە لە گوشینی هەستەکان

لە غوربەتا شیعرەکانم وەک پەنجەت بێ سازن
لە دوریتا هەناسەی ئەم سەوزاییەی باخم
بێ بۆن و بەرام ماون

گوڵ لە چڵی ناوت دێتە سەما
دڕکیش لە شەرما خۆی بریندار ئەکا

مەهێڵە بگەڕێینەوە یادەوەری ئەو وڵاتەی
کە فەلسەفەی ماچ و باوەش تیایدا باو نییە
مەهێڵە پەنجەکانم بوەرێ لە بەسەرهاتی بۆنی ئەو
ستیانە خاکییە
ئاوێنەکەت لەم دورگە
نادیارەی ڕوخسارم فڕێمەدە
لە بری ئەوە تاقمی مکیاجەکەت لەم خەراباتە بەجێبهێڵە
ئەمە دانیشتنێکی دوو بە دووە
بۆ ڕەنگ کردنی نینۆکی دەریا
و لە کل کردنی چاوی لم و
سوراوکردنی مانگێکی بێ داڵدەدان

هەردووکمان بەرەو کەوتنی یەکتری بە ڕێکەوتین
تۆ کاغەزی شێتیی ئەو تاراوگانەت بۆ من دەنارد
منیش لە دڵۆپە شەرابێک

(٤)

ونم بکە لە نێو دارستانی بەهار
مەمهێنەرەوە سەر سەکۆی ئاوابونی برینەکان
ونم بکە لە نێو قژی تەڕی باران
لەگەڵ پیتە مەستەکانی شیعر سڕم بکە
با سڕ بم تا ئەوپەڕی
بەرز فڕینی دەست و لێوەکان
ونم کە...
سڕم کە.... لە نێو خوێنی شەوانی شەوان
دامگیرسێنەرەوە لەسەر تەرمی تاریکی تاریکستان

(٥)

چاوەکانت پێشبینی ماچی دڵ گوڵێک دەکەن
هەڵاوی ئەو دڵۆپە خوێنانە
ژیان دەبەخشنە ئەم زەویە بەرینەی یادگاری

ئەوە خەونەکانی تۆیە
وا زیندانیی باڵندەکان ئازاد دەکات
پێکەنینەکانی تۆیە
هەرەس بە جەلادی ئەم وڵاتە دێنێ

(٦)

قەدەرەکان وەک خۆت جوانن
من ئەو قەدەرانەم خۆش ویست
کاتێک .....
ناوەکانمان لە دیوارەکانی پەیمانگا هەڵکوڵیبوو
کاتێک تۆ ئەو چرپە گۆرانییەی (داریوش) کە لە گوێی مندا چرپاند
کاتێک دەنگی ئەو ماچە سووتاوانەمان
لە ژێرزەمینێکی کلێسایەکی تەواو نەبوو دەهاتە دەرەوە و فریشتەی ئاسمانیان خەبەر دەکردەوە

قەدەرەکان وەک خۆت یاخین
وەک ئەو پیاسە دوو بە دووەی تەنیایی و ئارامیی

وەک زایەڵەی ئەو فلوتە شیرینەی سەر لێواری تاڵیی

وەک ئەو سەیرانە تاقانەیەی ئەو دەهرە

کاتێک من ڕۆحم پڕ دەبوو لە سەما و

تۆش دڵت پڕ دەبوو لە چۆپی کێشانی ژیان

..............

........

هاوڕێ نە من پێم ئەکرێ لەو ڕۆژانە پاشگەز بم

نە بۆ تۆش سانا ئەبێت قاوەی ئەو یادەوەریانە بە تەنیا

بخۆیتەوە

---

*(نانسی فلوت) کیژە هەورێکی هەتاهەتاییە ،کە هەرگیز لەیادم ناچێ لە باران هۆنراوەی بۆ بنووسم .

ئێسپییە ـــ ساندهۆڵم

دانیمارک

٢٠٠٨/٠٨/٠٣

# بۆم بنووسه...

بۆم بنووسه ئەگەر دڵت لە ڕەشەباکان ڕەنجا
بۆم بنووسه گەر باخچەکان لەسەوزایی تۆران و
چیمەنەکان مین ڕێژ کران
بۆم بنێرە ڕەخنەو گازندەکانت لەم دنیا بێ ئابڕووە..
لە دەرونی ڕەشی ڕۆژگارەکان بدوێ...
لە خەمی شینی ئاسمان بگری...
ئەو شەوانە دامەگیرسێنە کەبە تۆزی نیشتوی
ماچەکان واکەڕوو دێنێ...
ئەو بەیانیانە مەشێوێنە کە بەتیشکی
سۆزی هەتاو پێدەکەنن....
بۆم بدوێ...

دوای من چۆن زەوی بەدەوری خۆرا جارێکی دی
سوڕا؟؟
چۆن پەستانی خوێنی عاشقان لە مەرگی
باوەشەکان سوڕما؟؟؟
چۆن ڕقی ئاوەکان لە بەردەم درەختی هیواکان
بەلافاوێ خنکێنران؟؟؟؟
بۆم بدوێ ....
منی پڕ گوناه و تاوان...
لەبیرم دێ ڕۆژێک گوڵەکانم لەقەدی
خۆشەویستیان لێکردەوە..
لەیادمە .....
ساتەکانی ئامێزبونی دوو جەستەی پەرۆش
بۆیەکدیم شێواند...
بۆم بنوسە...
دوای من کێ تاوانی نوێی هێنایە کایەی ئەم زەویە
خەمبارەمان؟؟؟؟

٢٠٠٥/٠٨/١٨
ئێسپییە

# کۆشێکی تر

دەمەوێ ڕابکەم لەم گەردونە شێواوە و نەمێنم
دەمەوێ پێ کانم لە گوناهە کانی زەوی لێکەمەوە
باڵەکانم ببەخشمە ئاسمانێکی ساوا ...

دەمەوێ پڕ بە ترسی شەو
تێر لەخەمی ئێواران ون بم.
دەمەوێ ڕابکەم...
تادەگەمە وادەی کۆتایی بوونی(نەبون)....
دەمەوێ ئەوباخچە سەوزانەی کە گوڵی سور
ئارایشتی خوێنی بۆ کردووە جێبهێڵم..

دەمەوێ بەسەر ئەو جادە ڕەشانەی

که به (قیری) قین دروست کراون ڕابکەم..
دەمەوێ باز بەسەر ئەو هەموو گڕە نەکوژاوەی
جەنگەکان بنێم و
هەتا کێڵگەکانی حەزی خۆم نەوەستم...
ڕابکەم ......
ڕابکەم تادەگەمە ئارامیی زەوییەکی تر...
ڕابکەم ......تادەگەمە کۆشی هێمنیی نیشتیمانێکی
ئارامتر.

٢٠٠٥/٠٨/٢٨
**ئێسپییە**

# شەوێک لە جادەی (ئەڤەنیو)*

(١)

ئەمشەو بەقەد برینی ئەستێرەکان
لە ئاها کز ئەدرەوشێمەوە
بەقەد بێ سنوریی ئاسمان ئەمەوێ لەنێو هەورە
سورەکانی بەفر خۆم ونبکەم
ئەمەوێ لەگەڵ بێ نازیی گوڵە باخێکا
نەکرێمەوە،لەگەڵ نسرمی هەتاوێکا خۆم بسڕمەوە

(٢)

ئەمشەو زۆر بێ باکانە شەق لەشوشە شەرابەکانی
بەتاڵیی خۆم دەدەم ،،

زۆر زیاتر تنۆکی ئەشکی پایزێکی بەجێماو ئەنۆشم..
بەدیار تروسکاییەکی لێڵ لە خەون ،
بەدیار ئەو هەموو هەنسکە کۆنە پیرانەوە .
چاوەڕێی چیم؟؟
چی لە زستانێکی ساردی بێ گڕی ماچ بکەم؟؟؟

(٣)

ئەمشەو بێ ئەوەی بەخۆم بزانم هەزار نامەی
خۆشەویستیم دڕاند..
هەزار باوەشی گەرمی ئەوم فڕێدایە ڕوبار....
بێ ئاگاداری جەستەم جێ پەنجەکانی و ماچە
سوتاوەکانی کە بە گیانماوە نوسابون..
هەڵموەراندن..
هەر ئەمشەو زیاتر لەجارێک سەرینی حەزم
لە نوقمی خەونەکانی من و ئەو لێک جیاکردەوە،،
باوشم بۆ سەرابێکی تۆز لێنیشتو کردەوە..
هەناسەم لە ئاوابونی ژیانێکی خۆڵەمێشی گیربوو

ئیتر ...... ...

بۆ لەمەودوا ئەبێ ئەو ڕاستییە بزانم کە چیتر
زەنگی هاتنەوەی ئەو نابیستم..
چیتر ئاوڕ بۆ بانگکردنەکانی ئەو نادەمەوە...
چیتر شەوێکی دی بۆ ئەو نانوسمەوە..
چیدی سەما بۆ هاتنی گەڵا
سەوزەکانی بەهار ناکەم.

٢٠٠٥/٠٩/١١

یۆتۆبۆری ــ سوید

---

* جاددەی ئەڤەنین : بەناوبانگترین شەقامی شاری یۆتۆبۆرییە کە بە شەقامی خۆشەویستی و جوانی ناوزەند دەکرێ .

# گەڕامەوە

٧

گەڕامەوە بۆ باوەشی خەمێکی زستانیی ،
بۆ نوسینی چیرۆکێکی سارد لە گوڵ
گەڕامەوە بۆ بیستنی هاواری دیوارە
ڕزیوەکانی بیرەوەری شکست...
هاتم و خۆم کرد بەگژ
سوتانی ڕەنگە شێتەکانی عەشق...
کام عەشق ؟
عەشقی شەقامە چۆڵەکانی تەمەن؟؟
یان عەشقی وێنە لاسەنگەکانی ژیان؟؟؟
گەڕامەوە بۆ ناخی گریانێکی خنکاو لەنێو چاوما..
هاتمەوە بۆ ئەوەی کتێبەکان بەتەنیایی

بیانخوێنمەوە

،نۆتەکانی بەفر بە پەنجەی خۆم بسوتێنم...

هاتمەوە بۆ ئەوەی لەدرزێکی تری دونیا

چێژی ماچێکی قە رسیلەیی بکەم..

هاتمەوە بۆ ئەوەی لە باخچە تۆز لێنیشتووەکانی

جەستەمبتەکێنریم ...

ئای چەند سەختە..

ئەم گەڕانەوەیەم بۆ خاکی یادگارییە شێواوەکانم

چەند تەنگە ئەو ڕۆژگارانەم کە خۆم و شار و

دەریا و ڕەشەبا هاو دەردو هاوڕێ بین

٢٠٠٥/٠٩/١٦

یۆتۆبۆری سوید

# بەیەکەوە دەڕۆین

ئەوکاتەی کە دێمەوە.....

ئەبێ بەدەنگی کام گۆرانی بمناسیتەوە...؟؟؟

ئەبێ لە ژێر ئەو ئاوازە پڕ موچوڕکانە

چەند ماچ لەسەر لێوی بەختەوەریت بنوسم...؟؟؟

کەدێمەوە لە تەڕایی خاک هەڵتدەکێشم و

بەرەو هەناسە بێ کۆتاییەکانی ئاسمان دەڕۆین

....

ئەبێ چەند جار لەتەلیسمی ئەو ئاوە بڕوانم

بۆ ئەوەی وێنەی سەماکەت

لەسەر دڵم بەدی بکەم...؟؟؟

ئەبێ لەکام سرودی بەیانیانا بانگی تۆ بکەم و

پاسارییەکانی کام دورگەش
هەواڵی تۆ بۆ من بێنێ ؟؟؟؟
کەدێمەوە گریانی شوشەیی لەچاوەکانت دەردێنم
و نانی خۆشەویستی
لە جەستەت لەبەردەکەم

دەڕۆین ئەم زستانە بەساردی جێدەهێڵین...
ئەم جیهانە تەنها بۆ جەنگ و بڕین کراوە...
کەهاتمەوە لەپشتی کەشتییە
بێ سنورەکانی دەریا ڕادەکشێین
گوڵێکی نەمر لە ئامێزمان دەکەین
تا دەریا دیارە تێر باوەش بەیەکدی دەکەین.

٢٠٠٥/٠٩/٢١
ئێسپییە

# نامەوێ .... من نامە وێ

من...
من نامەێ ماچەکانم دوابخەم..
نامەوێ گۆرانیەکان بەکپی بمێننەوە،
نامەوێ نامەکان نەکرێنەوە و
قاقاکان مت بکرێن...
من نامەوێ دیوارەکان کەڕوبێنن،،
نامەوێ پەنجەرەکان بەسەر قژی بەهاردا
دابخرێن...
نامەوێ ساردی شەختەکان کارمتێبکا..
نامەوێ زریان نەمروژێنێ ،

نامەویَ لەرزینی زەوی
ڕوتیی خۆمم بۆ ئاشکرا نەکا،
نامەویَ خەیاڵی مەستی
لە شەهەوتی نۆشینی شەو بێبەشم بکا
دەمەیَ وەک ئاو بژیم و وەک ڕەنگ بدویَم
دەمەویَ وەک گوڵ هەمووساڵێک چرۆ بکەمەوە
وەک فرِینێکی پەرییانە  ون ببم...
من دەمەیَ وەک ئەستێرە شۆڕاوەکان بۆ
شەوەکان بدرەوشێمەوە.

٢٠٠٥/١٠/١٥
**ئێسپییە**

# ڕۆیشتن بەسەر شەقامێکی ساردا

بەسەر شەقامێکی سارد و سڕ دەڕۆم ....
پەنجەکانم بە ئاسانی لەدەستم هەڵدەوەرێن ...
ڕوناکی چراکانیش دەیانبەستێ ...،
تاسەی سەرم بەر دیوارە کۆنەکانی ڕابوردوو
دەکەوێت ...،
خشپەی پێکانیشم چۆلەکە وەنەوزەکانی شار بەئاگا
دێنێت....
بایەکی سەرشێت مێژووی گەڵاکان لەگەڵ خۆی
کۆدەکاتەوە،
دەستە بێ پەنجەکانم خستە ناو گیرفانی خەمێکی
زستانی ....

باڵم لەخۆرێکی زیوی گیربوو ...

لێوم لەسەر لێوی ئاسمانێکی
شوشە شکاوێک بریندار بوو
ویستم خوێنی جەستەم لەلاشەی پەڵە هەورێکی
کۆچ کردوو پڕ بکەم
وەک باڵدارێکی یەک کەوتوی دارستان
خۆم بە ئاسۆکانی ژیان بنوسێنم .....
ویستم خەیاڵی داهاتوی قیژەکانم
نوقمی لمێکی بێ بەزەیی بکەم ...
لەگریانی بەخوڕی لافاوەکان خۆم تورە بکەم.

٢٠٠٥/١١/١٥
ئێسپییە

# هێڵێکی وەنەوشەیی

هێڵێکی وەنەوشەیی بەسەر سپییێتی لەشی کێشا
لەبەردەم ئاوێنە بچوکە زیوییەکەی
سیمای دەمو چاوی خۆی خوێندەوە،،
لەشی هێشتا کەفی ڕابوردوە
جوانەکەی وەرزی هاوینی پێوە بوو،،
نینۆکی پەنجەکانی تازە بە بۆیەی
خۆر ڕەنگ کردبوو ،
قژی تەڕایی لە باران سەندبوو ،
هەواش لەگەڵ ئارەزوی
ڕۆیشتنەکانی دەلەرییەوە ..
هەرچی سیماو ڕوخساری خەمبارەکانیش هەیە

بەدەرکەوتنی شێوە ماسییەکەی دەکەوتنە بزە
دۆڕاوەکانی سەر مێزی خۆشەویستیش
وردە وردە ماچەکانیان
لەدەمی دەبردەوە ..
داستانی لەشی ،
بیرکردنەوە جوانەکانی بۆ دەستبازیی ،
چڕینی لەنجە سوڕماوەکان
بۆ حەزکردنی زیاتری دونیا ..
گوشینی پێستی خەمی نێرە پیاوەکان ،،،
سڕینەوەی ئاسەواری کۆنی
دڵەڕاوکێی باڵدارەکان ..
هەموو ئەم کۆ وێنانە
لە گەڵ کەسایەتیی مێینەی لەشی
تادەهات جوانتر دەگونجا ...
تا دەهات ڕونتر شانشینی ڕوناکی دادەگیرساند ....

هێڵێکی وەنەوشەیی

دوو گۆی مەمکی قاوەیی ...
گەردنێکی پڕ لە ئەفسانەی هەست بە بوون
دوو باڵی ناسکی پتەوی تێر لە ئەسرین
دیوارێکی پارێزراو لەپێستی خۆر
ئاواتەکانی لەئامێز گرتن دەهاتە دی ...
ئازارەکانی بینینی ناوبەناو
سارێژ دەکرد .....

(پەردەی بڵقی ئاو دەبووە پۆشاکی ڕوتی ڕاستییە شاراوەکانی)
(ڕەشەباکانیش دەبونە هاوڕێی کۆچەکانی بەرەو ویستنی خۆزگەکانی ئەوین)

٢٠٠٥/١٠/٣١
گۆردین

# پێشهاتێک بۆ بەهەشتەکان

بە کوشتنی خۆم لەتەنیایی ماچەکان ئۆخەی ناکەم
بەکێشانی دوکەڵی تاراوگەی حەزەکان ئۆقرە ناگرم ...
من ناوێرم دەریا بخنکێنم ..
ناوێرم زەوی بوەستێنم ...
ناوێرم کات بلاوێنم ...
بەڵام من سورم لەسەر نوسینی وەسییەتەکانی ئاو
من سورم لەسەر بینینی تارماییەکی وەنەوشەیی..
سورم لەسەربۆن کردنی هەموو کیژە جوانەکانی
نێو چیرۆکە خۆشەویستیە شکست بووەکانم.

هەتا بەفر دوا تنۆکە شەرابییەکانی دەبارێنێت
هەتا هەناسەی وەرزەکان تێکەڵ بە خوێنی
گڕگرتووی ژیان دەبێت

من شیعرەکان دەکوژم و یادگارییە شیرینەکانی
عیشق دەدڕێنم ..

من ئەو پلیکانە دوور و درێژانەی کۆتایی ساتە
هەنوکەییەکان ناگرمەبەر ،،،
من تەنها باز بەسەر کێوە سەختەکانی
سەوزایی دەدەم
کەهەورەکان ماچی بارانیان پێدەبەخشێ ...

من هەستی ڕووبارەکان ناشێوێنم
من تەنها وێنەی مانگ لەشیرخواردنی
شەوگارەکان دەگرم
تا لەجوانی خۆی نەکەوێ ......
من نامەوێ ڕێگە بە خۆر بگرم و
تیشکە ئاڵتونییەکانی بۆ مەرامی
جەنگەکانی خۆم بەکار بێنم،،
من دەمەوێ لەخۆم هەڵگەڕێم

و چیدی لە خەونە بە بەهاکانم یاخی نەبمەوە
من چیتر لەخەونی کوژراوی داهاتودا هەڵناپەڕم
با وشکایی ساراکان دامپۆشێ
لەتەڕیی بەرەبەیانێکدا لەگەڵ شەونمە شەرمنەکان
ڕووت و قوت ببمەوە.
با لەبیرۆکەی ڕەشەباکان هێور نەبمەوە
با زەنگە قورسەکانی تەمەن
بە ئاگابوونەوە خۆم لێیان بدەم..
با خۆم دەرگای بەرستگاکان بکەمەوە ..
باخۆم بەبێدەنگی بۆتان بدوێم
و تێر بۆ ئێوە بگریم .....
من ڕێ دەکەم بەرەو ئاسۆی نادیاری ڕەنگەکان ..
من پێدەنێمە نامۆیی ژورەساردەکان.
گەرجەنگیش لەپێناوی بەهەشتی ئەوین تاوان بێت
باهەر ببمە تاوانبار .

٢٠٠٥/١٢/٠١
ئێسپییە

# قاوەخواردنەوەیەکی تەنیا .....

خۆت ئەوەت هەڵبژارد ......
کە لەگوێی بێدەنگییدا بخەویت
هەر بەدەستی خۆت ویستت
کوشتنی خەوی کۆترەکانت پیرۆز بکەیت ،،،

بەڵێ خۆت لەتەنیایی قاوەیەکی ڕەشدا هێشتەوە..
نەتهێشت ترپەکانی دڵە پەشۆکاوەکەت
بگاتە ئارامگەی شینیی دەریاکان،

بەڵێ بەویستی خۆت بوو
جەستەی بێژنگت لەخڵتەی قوڕی یادگارییە

کۆنەکان بهێڵیتەوە ...
ئەوکاتەی ،بیری خۆت لەبیری
کەفی تاڵیدا ئاڵاند
بیرت لە ونبونی هەموو وێنەکان نەکردەوە
تۆ تەنهاترین مرۆڤیت کە بتوانێت
کڵۆی شەکری ڕۆح
لە سەر لاشەی (قرتماخ)بووی
ئەندێشەی قاوەیەکی ڕەشدا بتوێنیتەوە،،،

تۆ تەنهاترین پەڵە لا نەچووەکانی زامیت ...
تۆ سارد و سڕترین شاخی لەیاد چویت ...
تۆ تەنهاترین قاوەخۆری
ئەم ئەستێرە ناسکەی گەردونەیت .

٢٠٠٥/١٢/٠٧
ئێسپییە

# ئاهەنگی توانەوە

لە و ئاهەنگە تەنها سەمای بەفر
لەسوتانی ڕۆحم تێدەگەیشت،
لەو شاییە پڕ لەجۆشەدا
تەنها دەنگی پێی سەماکەرەکان هەرچی بیرو
هۆشمی دەتاساند...
بینیم....،
ئەوم دی کەچۆن لەگەڵ یەکێکی دی
ماچەکانی دەگۆڕییەوە..
باوەشەکانی کەدەبوایە تەنها بۆ ئامێزی من
بکرابانەوە
بۆ ئەوی تری والا کردبووەوە...

منیش کەمێک لەبەرزی خۆم هاتمە خوارێ و
لەگەڵ ئەوکەسەی کە نەمدەویست سەما بکەم
دەستیم گرت و تا دواهەناسەم لەوسەمایە خۆم
تواندەوە...
لەو ئاهەنگە تێر بۆ خۆم گەڕام..
بەدوای لاشە پەرش و بڵاوەکەم گەڕام
کە لەگەڵ ئاوازی ئاهەنگەکە لەت لەت بووبوو ...
تا وام لێهات کەگەیشتمە ماڵەوە
خۆم لەگەڵ شوێن خەوی یەکێکی تردا دۆزییەوە .

٢٠٠٥/١٢/٢
یۆتۆبۆری - سوید

# سپێدەیەکی زوو

سپێدەیەکی زوو...
شەقامەکانی ئەم شارەم بەسەر کردەوە ....
دەرگای کۆگاکان تازە دەکرانەوە
هەتاویش بەقیژەیەکی ئاواز ئاسا لەپشت
خانووەکان لەدایک دەبوو ...
سپێدەیەکی زوو ..
ناونیشانی شەقامەکانم دەخوێندەوە
سەرم لەنەخشەی کۆنی شوێنەکان دەسوڕما
...
تەپوتۆزی ڕێگاکان لە پای یادگارییەکان دائەکەند

❊ ❊ ❊ ❊

ئەمە زووترین بەیانیی بوو لەژیان
کە بەتەنیا ڕێم دەکرد
هەردوو دەستی ساردم
لەگیرفانی خەما گیر ، پاراستبوو..
بە ئەسپاییەکی ئێجگار خامۆش ڕێم دەکرد....
لە روخساری ئەوخەڵکە خەواڵووەم ئەڕوانی....
چاویانم دەکردەوە....
دەستیشیانم بۆ دەخوێندنەوە...
ئەوەی بەدیم کردلێیان :
ڕاستی شەویان بەئاسانی ناشتبوو
ئەستێرەی ماندوی بەختیان کوژاند بوو...
گریانێکی سەرچۆکانەیان هەڵڕشتبوو
بۆئەوەی لەبەیانییەکی زوودا،....
بەخەندەیەکی تەنیا پێشوازی لە لاشەی
تەڕی من وباران بکەن .

٢٠٠٥/١٢/٢٠
جادەی پیادەی کۆپنهاگن

ئەم زەمەنە ئاشوبە جێدەهێڵم ...

کات وەک ئەژدیهایەکی ئەفسوناوی دێتە بەر ڕێگام.

# بۆدایکانی هەموو زەوی

دایە...

لەمێژە ئەم وشە کۆنانەم بۆ داناوی...

لەیەکەم ڕیز بەندی کۆنترین نوسراو ..

لەمناڵێتی خۆر........

لە هەتیوی ئەو بۆشاییەی نێوان زەوی و ئاسمان.

لەمێژە ویستومە ئەوناوەی پڕ لە خوناوت...

لەتاریکی جلی گەڵاکانی خەمەکانت دەرکەم ......

لەنیشتەجێبونی یەکەم هۆز لەتاراوگەی ئە وین...

لەمەرگی یەکەمین کۆرپەی ماچ ...

لەڕوخانی دوایەمین کۆشکی لمی گەردون.

دایە...

تۆ بۆ لەباتی دەریاکان دەگریت ؟

تۆبۆ لەجیاتی هەوری زستان ئەقیژێنی ؟

تۆ لەسۆراخی هاتنەوەی کەشتییە ونبووەکانی

تەمەن گەڕێ...

من دەمێکە نوقمی عومری کۆشی تۆ بوم .

دایە ... دایەی هەموو زەوی

لەمێژە ....

هەر پێش لەدایکبونی بەفر و

دوای مردنی خەونەکان ....

من نینۆکی ڕەشەباکانم شکاند ...

چەپۆکی شۆستەکانی چاوەڕوانیم تەزاند .....

تۆ بۆ لەباتی قڵیشانی خاک خۆت وشک دەکەیت ؟

بۆ لەنێو درزە تینوەکانەوە دەناڵێنی ..؟

بۆ لەبری قەدەرەکان بجەنگێی .. ؟

دایە ... هەر لە جارانی دڵە وردیلەکەم
هەتا باوەشی گەرمی عەتری خاکەکەت
من وەک شاخێکی بەستەڵەک ئەتوێمەوە
من دەمێکە لە پەشیمانی هەموو گوناحەکانی
سەفەرم  ئەسوورڕێمەوە.

٢٠٠٦/٠١/١٠
**ئێسپییە**

# سەفەر لە ڕێگەی شوشە

لە پەنجەرەکەوە ویستم سەفەر بکەم ...
ویستم ئەو باڵە شکاوانەم کۆبکەمەوە
تا توانام هەیە بفڕم ...
چ پەنجەرەیەکی شەهوانییە بۆ سەفەر ..
منیش چ مرۆڤێکی بێ ئەزموونم لەفڕین و
کۆکردنەوەی شتەکانم .. ؟؟
لەتێڕوانینم بۆ ئەو شوشە ئاوییەی ئێوارانداا
هەستێکی بێ کۆتا دەمباتە یادێکی ئەوسا ..
ئەوسا کە تازە بەتازە فێری
ڕۆیشتن دەبوم و دەکەوتم ...

ئێستاش لەدیوی پەنجەرەیەکی
تردا حەزێکی بەهێز
پاڵم پێوەدەنێ بۆ ئەوەی بڕۆم و هەرچی
کارەساتە بەجێبهێڵم ،
هەرچی (با) هەیە لێیان هەڵبێم ..
پەنجەرەکە لەچاوەڕوانی مندا خۆی دەشکێنێ و
منیش لە نزیکبوونەوەم بۆ کردنەوەی ،
خۆم دروست دەکەمەوە ...
(هەمیشە ئەم دیوی پەنجەرە هی خۆمە و ئەوەش
بێزارم دەکا
ئەودیویش، سەفەر خاوەنێتی و بانگەواز بۆ
گەشتیارانی وەک من دەکا بۆ هەڵهاتن)

٢٠٠٦/٠٢/٠٧
**ئێسپییە**

# قژت دابێنە

قژت دابێنە ...
ئەی بۆنخۆشترین میوەی سەر ئەم گەردونە ...
قژت ڕابێنە لەسەر درووستبونی
یەکەم هەناسەی ژیان ....
پرچت گرێ مەدە باچیتر جیهان
ئاڵۆزت نەکا
..
دەستت بەقژی ئاڵتونیت بێنە کە لەسەر
مەمکە زیویەکەت هەناسە دەدا ...
لەخۆر مەپارێزەوە گەشترت بکا ،

له (با) زیزمەبە کە قژت تێک دەدا ...
تۆ تەنها بەڕوی ئاسمان برۆ و
لەمەرگەساتی ئەم زەوییە مەپرسە.

٢٠٠٥/٠٣/٣٠
**ئێسپییە**

# کچانی شار

کچانی شار
بەدوای کوڕە خەونەکانیان دەگەڕێن ..
تاوێک وێڵن و تاوێکیش نابینا ....،
منیش لەدوورەوە کاروانی حەزی شێتیم
بەرەو گیانی پڕ سۆزیان ڕاودەنێم ..

کچانی شار..
خەمبار و ماندو و دەستەوەستانن ،
سەیری هاتنی خۆرێکی بێهودە دەکەن ..
منیش لە دوورەوە لەناخی زەوییەکی بێپیت ،

پێکەنینە شیرینییەکانیان ڕاو دەکەم و دەیانبزوێنم ....

ئای لەکچانی شارێکی بێ ئاسمان و بێ فڕین و بێ باران ....
ئای لە کچانی شارێکی بێدەنگ و پڕ مەرگ ....
لێم ببورن ئەگەر بەقەد پێویستی هەوا خۆشم نەویستن ..
لێم ببورن ئەگەر بەقەد پیرۆزیی ئاو نەمنۆشیبێتن.

٢٠٠٦/٠٤/١١
**ئێسپییە**

# لە ئێوارەیەکی پڕتەقاڵیدا

ئێوارەیەکی پڕتەقاڵی بوو...

ئاسمان هانای بۆ ئەستێرە

بێنازەکانی دونیا دەبرد...

(با) بەکزی ڕەوی دەکرد بەرەو

ئاسۆ زویرەکانی ژیان

خۆریش بە تەنیا و بێ هیچ نزا و

تکایەک خۆی دەناشت....

هەڵاوی شەرمیش لەجەستەی

هەردوکماندا هەڵدەستا...

من وئەو...

تەنیا بوین لەسەر ڕۆخی ڕوبارێکی هێمن .....

زۆر هێمن...
نەمن دەستە پاکژەکانی ئەوم ماچ کرد...
نەئەویش بۆنی خۆشەویستی لەجەستەی من
کرد...
نە من نیگا ئەرخەوانییەکانی چاویم خوێندەوە...
نە ئەویش کەشی یەکتربینینمانی هێورکردەوە..
لەو ئێوارە پڕتەقاڵییەدا...
تەنها بۆ چرکە ساتێکیش چاوی ئاسمان نەدەتروکا..
دەریای خەیاڵی حەزی هەردوکمان خەوی
لێنەدەکەوت...
دەنگی پر سۆزی مانگ
لەئاوازی ئاوێزان نە دەوەستا...
..............
منیش لەگۆشەگیری بۆ یادگارییە
کۆنەکانی سەرشێتی خۆم نەکەوتم
ئەویش پێوانەی شەرم و
دووریی هەردوکمانی لەسەر دیوارە

ڕەشەکان سپی نەکردەوە

من ئەزانم سپێدە بۆ خۆکوشتنم دێتەدەرەوە....
ئەویش فریای بەسەرکردنەوەی من و
گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەوئێوارەیە ناکەوێت.

٢٠٠٦/٤/٢٥
**ئێسپییە**

# شەوێک بۆ تاوان

ئەمشەو بۆ تاوانێک دەگەڕێم
دژ بەو دڵە لماویە بکەم

ئەمشەو دەستەکانم
لە دەستی شەڕانگێزێک دەچێ
کە بەزەیی بەئاسمان و بە زەوی ڕۆحم نەیەتەوە.

دەمەوێ ناخی دەریا لە کۆشما بخنکێنم
هەوای درەوشانەوە لە ئەستێرەکان بدزم

ئەمشەو سەراپام تاوانە...

یان ڕێکردنی تەنیایانەیە لە ناو کۆڵانەکانی ترس.

ئەمشەو بۆ شتەکانی خۆم دەگەڕێم
بۆ وێنە کۆنەکانی بەیانیان و
بۆ نوسینە دڕاوەکانی ساتی بێ ئارامیم دەگەڕێم.

ئەمشەو ئەمەوێ شوشەی تەنیایی
لە چاوی خۆمدا بشکێنم

تازە بێهودەیە هاتنەوەت...!!!
بێهودەیە بۆن بە هاتنی سپێدەی خەونێک بکەم
تازە ئاستەمە لە ژێر مەمکی زەوی بنوم و
بە تەنیشت باڵی کوکوختییەکان بفڕم

ئەمشەو......
هەر چی چرای شەقامەکانە
بەخەمی کز بوونەوە دەکوژێنمەوە

هەرچی ڕێگا تاریکەکانە
بە (پێ) برینداره‌کانم چۆڵ و خامۆش دەکەمەوە

ئەمشەو باران لە ڕۆحی مندا دەگری
هەرچی ئەختەری ئاسمانە نوێیکانە بەمن پێدەکەنێ

ئەمشەو ........
جلی ڕەشی (با) دەکەمە بەرم
پێگەی مۆمە بێ نازەکانی تەمەنێکی
پەرش و سوتاو دەشێوێنم

بۆ تاوانێک دەگەڕێم
دەرحەق بە جەستەی یادگارییەکانیمی بکەم
بەڵام من جگە لە سوتویەکی خۆشەویستی و
جگە لە خۆڵەمێشێکی یادەوەری زیاتر نیم....
بەچی تاوان بکەم....؟
بەچی .....؟؟

کە چەقۆی بندەستم لە ئاسمان سڵ بکا و
فیشەکی پەنجەکەم لە جڵەوی هەورەکان شکست بخوا ......
ئەمشەو چۆن دەبمە تاوانبار؟؟؟
چۆن ببمە تاوانبار.......؟؟

٢٠٠٦/٠٦/٠٦
**ئێسپییە**

# ونبوی کەشتییەکەی زەمەن

ئەمڕۆ دایکم وەبیری هێنامەوە کە من ماوم....
بیری خستمەوە کە من لەشەودا،
ئەوکاتەی کە لەنێو جێگای بوونمدام
بۆ خەوێکی سەرابیی دەگریم و
لە رۆژیشدا بەئاسمانی نائومێدی قاقا لێدەدەم.

ئەمڕۆ .... دایکم بە بێدەنگی پێی گوتم ..
کە دەبێ بێمە قسە ..
دەبێ تنۆکە دوودڵییەکانی باران

یەک لە دوای یەک بژمێرم،
دەبێ وشە لە هەور بستێنم و ،
تورەبوون لە بروسکە بفرێنم ....
هەست و سۆزی گوڵێک لە باخچە نەمرەکانی
گیانم بۆن بکەم

ئەمڕۆ....دایکم وەبیری هێنامەوە کە من مرۆڤێکم..
لە پەیکەری دەریا داتاشراوم،
لە بێدەنگی ئاو ون بووم،
لە چاوی لم فێری نابینین بووم.
ئەمڕۆ....
هەر کە زەنگی تەنیایی لێیدا
دایکم زۆر شتی بیرخستمەوە...
هەناسەکانم کەلەمێژە نەمسوتاندبوون ...
بە رووی کەشتییەکانی تەمەن سوتاندم
دەستەکانم کە دەمێکە نە شۆرابوون ...
لە ژێر لافاوی خۆڵەمێش شوشتم

قژم کە سەدەیەکە دامنەهێنابوو ..
بە ئاڕاستەی ڕەشەبا دامهێنا .

دایکم لە بەرینی دەشتە بێخاوەنەکانی کات
رایچڵەکاندم .....
من خەوتبووم ؟!
دایکم خەونەکانم لە بێژەنگی هەتاو دەدا
دایکم ئارەزووە شکاوەکانی مناڵێتیم بۆ دروست
دەکاتەوە...
دایکم .... دایکم ..... دایکم چەند پڕ داهێنانە

ئێستا دایکم کە دەگری
من تامەزرۆیی هەنسکێکم
کە پێدەکەنێ
من لێوم دەکەوێتە سەما....

ئەمڕۆ دایکم لە سێبەری شاراوەی

سەدەکانی ماتبوونم لێک جیا دەکاتەوە و
پۆشتەی خاوێنی و بەتاڵیی بەرەبەیانم دەکاتەوە...
بەڵام من لە یادکراوم ئەمەوێ پاکببمەوە.

ئەمڕۆ دایکم وەک شیعرێکی سپی
شەرمێک لە پشتی جەستەم دەسڕێتەوە و
پەیڤێکی شیرین لە گەردنی ئاسمان دەنوسێ
بۆ ئەوەی لە مەرگە پەشمەکییەکانی تەمەنم نە
نوسرێمەوە

ئەمڕۆ دایکم ختوکەی مناڵیمی دا ..
گۆرانییەکانی سەر بێشکە شکاوەکەی
زستانی نوێکردەوە
......................،
..................،
ئێستا دایکم جگە لە پاشماوەی یادگارییە
شوشەییەکانی،

سەرکێشیم هیچ شتێک هاوەڵی نییە
جگە لە وڕێنەی جلە کۆنەکانم هیچ دەنگێکی نییە
جگە لە ساردیی پێخەفی سەرماییم هیچ
گەرمایییەکی نییە

من ئیستا بیرم دەکەوێتەوە
کە دایکێکم هەیە
وەک چڕیی تەمەنی درەخت بۆ بێستانەکان
وەک هزری نوقمی دەریا بۆ دەریاوان
وەک تەبایی ئاسمان بۆ زەوییەکی پان
وەک شەهوەتی نێرگز بۆ ژیان

بەڵام من لەیادکراوم تازە نامدۆزنەوە،
دایکانی هەموو دونیاش پاکم ناکەنەوە

٢٠٠٦/١١/١٤
ئێسپییە

# دوا وتەی شاعیرێک

نەما ئەو شاعیرەی دەست لە
پرچی وشەکان بدا و
ژیان بکاتە قەسیدەیەک لە فەنتازیا...
نەما ئەو گڕ و تینەی عاشقێک
کە بە نیشانەی پەنجەیەک لە خۆشەویستەکەی
دڵی دەکەوتە فڕین..
نەما ئەو پانتاییەی نێوان
هزرو تێگەیشتنی مرۆڤێک
کە بە دڵە پاکەکەی جیهان بکا بە کتێبێک ،...

نەما ئەو خوێن گەرمەی
کە سەراپای تەڕایی بوو و
گشت هەستەکانی پڕ بوون لە ورە....
ئەو شاعیرە...
بە نیازە ئەم جیهانە ناهەموارە جێبێڵێ و
سەری بەر سنورە بەجێماوەکانی
(عەدەم) بکێشێ....
ئەو شاعیرەی کە تەنها ڕابوردوو دەیکوژێت و
یادگارییەکان جارێکی تر لە خاچی ئەدەن...

ئەو شاعیرە بە نیازە شەوگارەکان جارێکی تر
دانەگیرسێنێتەوە
ڕۆژگارەکانیش بکوژێنێتەوە.....
ئەو شاعیرەی کە دەبوو ژیانی خۆشبویستایە و
لە گەڵ شەپۆلەکانی تەمەن و زەمەن
بەرەنگاریبکردایە..
وا بە نیازە چراکان

بەرەو ڕووی ڕەشەباکان بکاتەوە و
کۆمەڵە شیعرەکانی فڕێ بداتە دەریا و
ئاوێنەکان بداتە خۆڵ و
تابلۆکان ببەخشێتە ئاگر .......

ئەو شاعیرەی ڕۆژێک لە ڕۆژان پێیان وت:_
(مەنوسە)....
(مەنوسە)....
(مەنوسە) شیعر _ ژیان مەنوسە!!!!

٢٠٠٦/١١/١٩
**ئێسپییە**

# سەراب

*بۆ (سەراب)ی خۆشەویستی لە باکور*

ئەی (سەراب)
تۆ لە ئێوارەیەکی پایزدا دەرکەوتی و
ژیانت بەخشییە چاوە نوقاوەکانی ئەم زەمەنە..
تۆ سەرابی وەنەوشەییت کردە نێو
یادگارییەکانی لمی سەفەرەکان
تۆ لەبری ڕەشەبا پەککەوتووەکان دەرکەوتیت
تۆ هاتیت و گەڵای گەنجەکان پیربوون
ڕوخسارت کردە میوانی ئاوێنە تواوەکان
وەرزەکان لەسەر لەپی دەستت تکای هاتنیان
لێدەکردی...

مەملەکەتی ژیان  خۆشبینینیان بۆ ئەهێنای

ئەی (سەراب)
تۆ دەرکەوتیت و زەوی بەدەوری تۆ دا خولایەوە
کە تۆ هەموو شتەکان بویت ....
بۆ وەک نزیکیی سەراب دیار نەمایت ؟

٢٠٠٦/١٢/١١
**ئێسپییە**

# بێهوودە بوو گیانە ... بێهوودە بوو

بێهودە بوو گیانە ... بێهودە بوو
هەموو هەوڵەکانمان بۆ ئاشتبونەوەی
دەست و پەنجەکانمان ،
سینە و قژمان ،
لەو پایزە بێهودەبوو...
من ئەڕۆم تابلۆیەکی تر ئەبینم
سەمایەکی تر دەگێڕم
ئەڕۆم ڕۆژانێکی تر دەنوسمەوە
بە خەیاڵێکی تر دەخنکێم ...

بێهودە بوو گیانە ... بێهوودە بوو
هەموو هەوڵەکانمان بۆ ناشتنەوەی
ڕقی کۆن و دڵی بەرد،
لەو گۆڕستانە بێهودە بوو ...
من ئەڕۆم ئەم گەلە یادگاریانە
لەپشت خۆم فرێدەدەم
ئەڕۆم و پارچە پارچەیی خۆم کۆناکەمەوە
با مێژوو بە کەرت بوونم ،
لە سەر ڕێگاو باخچەکان بنوسرێتەوە

بێهودە بوو گیانە ... بێهوودە بوو
ئەی نیشتیمانی دڵ بەجێت دەهێڵم
ئەی کانیاوی وشە ماڵئاوا
ئەی بێستانی دڕک مەرگت لەگەڵ
ئەی هەناسەی دوریی ژیانت شیرین

١٢/١٢ ٢٠٠٦
<u>ئێسپییە</u>

بۆ دانیشتنێک لەسەر سەکۆی ئاسمان شیعرەکانم فڕێ دا ....،

هەناسەکانم لە کەنار دەریا سوتاند.

# چرپانە شیعر

لە خرۆشانی ئەو ئێوارە پڕ شیعرە تێنەگەیشتم
لە ئاویێتە بوونم لەگەڵ دەقی ئەو چامانە
نەگەیشتمە ئەنجام

کاتێک بەشێک لە گیانی خۆمم بۆ خوێندەوە
کاتێک بە هێمنی ئەو وشانەم بە گوێدا چرپاند
دڵنیا نەبووم....
ئایا لە ماناکنیان دێتە هەڵوەرین
یان وەرزێکە و بەسەریدا تێدەپەڕێ
دڵنیا نەبووم...

له خوێندنی شیعری من سەری دێتە ئێش یان
گەشتێکە و لە سنور دەردەچێ ؟

٢٠٠٧/٠٢/٠٦

**ئێسپییە**

# شەوی ئازیز

شەوی ئازیز
ئەی سەرابی جادووگەر
ئەم جارە هەرگیز ڕێگەت پێ نادەم
ئەو پەنجە ساردو تەزیویانەت
بەر دەستە گەرم و خاڵیەکانم بکەوێ

شەوی ئازیز
ئەی گەردی شەڕکەر
هەرگیز ڕێگە بۆ ئەو شوێنەوارانە خۆش ناکەم
کە لە یەکەم دەرکەوتنت دا
ماچم لەگەڵ ئەو سوتاند

شەوی شوشەیی ئازیزم
ئەی تەژنەی هەتاویکی ڕاوکەر
ئەم جارە دڵم ناکەمە  پێم و
بە هێزی هەموو دونیا ڕادەکەم
بەرەو بیابانە تینووەکان دەڕۆم

شەوی ئازیز
ئەم جارە ڕوخسارم پڕ ناکەم لە شەویی تۆ
ئەبمە پاسەوانی چرای ئاسمانێکی ڕوناک و
کات و ساتەکان لە ڕۆژمێرەکان دەسڕمەوە
ئەی وەرزی بیرەوەریی کەرت بوونم
ئەم جارە هەرگیز لەباکوردا نامەوێ بتوێمەوە
نامەوێ  جارێکی تر هەناسەکانم بیان بەستێ و
شەختە ، ئارامیی لە شیعرم بگوشێ

٢٠٠٧/٠٢/١١
ئێسپییە

# بۆ نا ئومێدییەکانم

ئەم ئێوارەیە
بۆ ئێوە دەنووسم
بۆ ئەو هەناسە پڕ لە نا ئومێدیانەی پایز
بۆ ئەو گەشتە پڕ شکستانەی زەمەن

ئەم ئێوارەیە
بۆ ئێوە دانیشتووم
لە یەکە یەکەتان دەڕوانم
ئێوەن پشکۆ چزیوەکانی ڕۆحێکی دزراوم
ئێوەن لەرز و تای جەستەی داڕووخاوم

من لەم ئێوارەیە ئەتانبینم

ئەتانبینم ..........

هەناسەی ژیانم دەکوژن

گەرووی فێنکی هیواکانم وشک دەکەن

٢٠٠٧/٠٤/٠٢

ڕۆسکیلدە

# وەرزی ڕاو

لە شەوی زستاندا
پەنجەکانم گڕ ناکەن
چاوانم بۆ بینین نا تروکێن
مەبەستمە ئەم مۆڵگەیە وێران بکەم
مەبەستمە ئەم ئاسەوارەی پڕ لە گریان بسوتێنم

لە بەیانییەکی بەهاردا
ڕێگەم بە سۆزانییەکی سروشت گرت و
هەتا باخچە دیارە لەسەر گوڵەکانی خەوتم
مەبەستمە ئەگەر بڕوێم

هەر وەک پەڕەی گوڵ بڕوێم
لە لەزەتی سەوازیی بێمە قسە و
لە ڕووبارا تنۆکێ ئاو بەشم بکا

٢٠٠٧/٠٥/٠٥
ساندهۆڵم ـ کۆپنهاگن

# ئەمە دوا ئێوارەیە

ئەمە دوا ئێوارەیە
بۆ مەستیی سەرسنگمان دادەگیرسێ
ئەمە دوا شەونمی ئەم وەرزەیە
لە ڕوومەتی هەردوکمان ئەتکێ
ئەمە دوا وشە و دوا ئامێز و دوا بڕوایە
بۆ بونمان لە ڕوخسارمان هەڵدەوەرێ

دە بفڕە....
دەسا بفڕە....
ئەی پەریی بەجێماوی پۆلەکەت
دەبفڕە و تێر قاقا لێدە
ئەی ڕاونەری هەموو هەست و حەزە پڕ
پرسیارەکانم....

بفڕە و هەرگیز جارێکی تر لێرە مەنیشەرەوە
دڵی گوڵینت تازە لە باخچەی
وشک بووی گیانم نارِوێتەوە
گەردی بێشومارت لەسەر سنگم نا ئاڵێتەوە
بڕۆ ئەی مێرگی پڕ باران و ئاو
لە نێو چاوی پیریم
خۆت دەرکە و لە چاوی یەکێکی تر
خۆت بخەوێنە
بڕۆ.......... بڕۆ
دوریت جوانترین شتە من پێی مەستم...
دوریت تاقە ئومێدێکە ...
بۆ مانگی عیشقمان بدۆزرێتەوە
بڕۆ ... بفڕە
بەڵکو جارێکی تر لە ڕێکەوتێکی باشتر لە ئێستا
بتناسمەوە و بمناسیتەوە.

٢٠٠٧/٠٥/٢٢
ساندهۆڵم ـ کۆپنهاگن

# بۆشاییەک نەماوە ناوی بنێین (ئامێز)

ویستگەکان تاوێک چۆڵ نابن
تا لە تەنهایی دوو توولە ڕێی سەفەر بۆت بنووسم
ڕوانینەکان بۆ تەنیا جارێکیش لەو ڕابووردووە
تێکشکاوەی زەمەن
ئاوڕێک لەو بەسەر هاتە ناداتاوە

لە شەوییێکی کەمێک فێنک
نە بەهار و نە پاییز
من بۆت دەنووسم
لە ژێر گەڵە درەختێکی بێ ورە
من مەستم بۆ وتن و

تۆش خۆش بەخشی بە بیستن

تۆ وەک ئاسمان وا بویت
گوێت شل و چاوت بە گریان
منیش جەنگاوەرێکی سەر شێت و بێ چارەنووس
من بە  خۆباییەوە باسی جەنگە
وەهمییەکانم بۆ دەکردی
تۆش وەچانت نەدەدا بۆ پرسیارێک
من وەک پیرێکی بێ تەمەن
کاتم دوا دەخست
تۆش وەک منداڵێکی لاسار،
وەڕەس لە یاریەکەی ..
من وەک شاعیرێکی کوژراو
وەک ڕاهیبێکی بێ متمانە
شیعری وەرینی پەنجەکانی بارانم
بۆدەخوێندیتەوە...

ئەمزانی تۆ لەو خوێندنەوەیە هیلاک دەبیت
خەو دەتبات بەرەو چۆڵەوانیی شارەکان
من ناچار بووم یەخەی کراسە خاکییەکەت ڕابکێشم
هەتا بەقەد تۆسقاڵێک زەمەن ماوە
دوو گۆ لە ڕەنگی ئاوابوون و لە هەمان کاتدا دوو
مانگی گۆشتیی ئەم زەویە ببینم
تۆ خەوتبویت ....
کەچی بە پەنجەکانت تۆزی کۆنی ڕابردوو ، لە
شانم دەتەکاند
تۆ ئەوەندە گەرمبویت
بەفریشت لە خۆت کردەوە
من پاڵتۆ سپییەکانی تامەزرۆییم کردەبەر
تۆ گوێت نەدایە تاڵیی قاوە و نۆشت کرد
منیش لە تفتیی مەستی پێکێ شەرابدا
خۆم و جیهانم سەرخۆش کرد
... دانیشتین
هەردوکمان لەو باکورە دانیشتین

ڕەنگی خوێنی ئەو گوڵە هۆڵەندیە لە دەماری من
دەرهێنرابوو
وشەکانی ئەو چامەیەیی کە بۆم خوێندیتەوە
چەندەها شەوم بێ ڕۆژ بوو
دانیشتین ....
ئێمە زۆر دانیشتین
بۆشاییەک نەبوو ناوی بنێین ئامێز
... دەستم گرتی
تۆ لەو دەست گرتنە ڕەشەباکانت نەهێنا
... ماچم کردی
تۆ لەو ماچانەم هیچ شوێنێکت نەلەراند
نازانم من تۆم گەڕانەوە دۆخی ئاو
یان هەوا ...؟
تۆ هەر نەبویتە دەریاچە و فڕین
من تۆم هێنایە سەر سکەی دوایین ڕوناکی...؟
تۆبویتە تەمێک و دوای ماوەیەک نەمایت
تۆ لە بێزاریت دەستت خستە کەمەرم

وەک بێ چارەیەک خۆت پڕ کرد لە من
من لە بێزاریم دەستم لە تورەکەی سینگت
گیرکردبوو
دەمویست مەمکانت بگوشم
بەڵکو بەو گوشینە بارانێک بێنیتە باران
گڕی جەنگە دۆڕاوەکان بکوژێنیتەوە

تێر باوەشمان بەیەکدی کرد
بەڵام هێشتا بۆشاییەک نەبوو ناوی بنێین ئامێز
لە یەقینیی ئەو گومانانە دەگەڕاین
دەتوت سەر بە دوو خێڵی
قەرجی بێ ئاسمان و بێ نیشتیمانین
تۆی هیلاک و ماندوو بەدەست
بڕیارەکانی قەدەر
منیش سەر سەخت و گەمەباز
لە ڕێکەوتەکانی سەفەر
من بێ شەرمانە قژتم لە شەوێتی خۆی تێک دەدا

لێوتم لە سوراوی خۆر دەکردەوە
ڕوومەتت لە سپیاوی خەیاڵەکان لادەبرد
تۆ هۆشت لێ بڕا بوو
تۆ بوبویت بە سەراب و منیش بە وەهم
تۆ بوبویت بە غوبار و منیش بە ئاسەوار
من لە نمایشەکانم نەکەوتم
تۆش لە تاو نواندنی ئەو خۆشەویستییە
درۆت بۆ نەخستمە سەر گومان
پێکەنیین ..... خەوتین .... دانیشتین
بەڵام هەردوکمان بەد فڕیین
تۆ پرسیارت نەکرد ئەم خۆشەویستییە
بۆ دەبێتە تاوان ؟؟
من لە تاوانا ...
خۆرم لە ئەزەلەوە تەزاند
شەوم لە حیجابی فێنکیی ڕووت کردەوە
شیرینی ئەوسای دەریاکانم سوێرکرد
تا لە پەڕاوی شەرم و بێ عاری

ناوی من بنوسرێ .....

........،

تا لە بیرەوەری جەستەی خۆتدا

هەر من و ئەو تاوانە بین  هەتا توانات هەیە

بمانکرێنی.

٢٠٠٧/٠٥/٢٥

ساندهۆلم ـ دانیمارک

# چێژێکی جادوو

کەمێک لە نا ئارامی خۆم ورد بوومەوە ،
هیچم بەدی نەکرد جگە لە چەند دڵۆپێکی ترس و
چەند ویستگەیەکی نادیار

لەم شوێنەمەوە بیر لە نامۆیی ئێستام دەکەمەوە
بیر لەو دەستانەم دەکەمەوە کە گومانم هەیە هی
منن ....
گومانم هەیە کە ڕۆیشتنەکانم هی خۆمە

من ماوم ،،،
من هەتا ئێستا ماوم کەژێکی سەختم بڕیوە ،،

من لەم گوزەرەی عەشق وا داماوم،
من لەفڕینێکی ئاسایی دا بەرەو
کەناری دورگەکانی ئەوین دا بەجێ ماوم،،
من ماوم نەمردوم ......
ئەزانن چ چێژێکی جادووە کە هەست
بە پاشایاتی ناو ناخی خۆت بکەیت و
سەرلەنوێ خۆت لە هەموو پیشە نائومێدییەکان
نوێ بکەیتەوە؟

٢٠٠٧/٠٦/٢٣
ساندهۆڵم ـ کۆپنهاگن

# هۆنراوە نووس

خەوی من ناگاتە سپێدە و ون دەبێ
دڵی من ناگاتە سبەینێ و لە لێدان دەکەوێ
ئەم مەرگەساتەی کات هیچی بۆ نەهێشتووم
کێشەم ئەوەیە .....
من هەر ئەنووسم و فریایی وشەکان ناکەوم
من هەر ئەژیم و فریای ژیان ناکەوم
کێشەم ئەوەیە......
سەماکەرەکانی سەر سەحنەی ڕۆحم
تاوێک پشوو نادەن
دڵۆپە بزمار ئاساکانی باران

بەسەرسەرمەوە تاوێک ناوەستن
ئەوە منم دەفڕم یان ئاسمان ؟
ئەوە منم ئەسوڕێم یان زەوی؟
کێشەکەم ئەوەیە....
پرسیارم هەیە
ئەگەر هۆنراوە نووس نەبومایە
چی دەبووم ؟
خەو یان باران یان ئاوی مەرگ ؟؟

٢٠٠٧/٠٨/١٥
ساندهۆڵم

# گەشبینی هاتنەوە

خەونێک هەیە دەنوسرێ
باوەشێک هەیە ون نابێ
هەورێک هەیە دەگری
بەڵام دوایی پێدەکەنێ
خۆرێک هەیە ڕووناکی و گەرمی دەڕژێ
دیمەنی مەمکێ دەکرێتە تابلۆی ژیانێ
لێوی حەزێ تامەزرۆیی دەچنێ
جەستەی شیعرێ
بەرکەوتی پەنجەیەکی سیحری دەبێ
لاشەیەک لە ئاو

بەر تامی هەوایەک دەکەوێ
تۆ ئەو هەموو ئەفسوناویەت لە کوێ بوو؟؟
تۆ ئەو هەموو ڕامانەت لە دەریا لە چی بوو ؟؟
تۆ ئەو هەموو گەشبینیەت بۆ هاتنەوەی من لە
کوێ بوو ؟؟

٢٠٠٧/٠٨/١٥
ساندهۆڵم

## نەختێک لە تۆ

کەمێک لە ئاسەواری من بگەڕێ
وەرە لە دەورو‌پشتی کێڵگە گەنمەکانی
تەمەنم ڕابکشێ
با (با)ی ئەو ئاشە هەواییانە کەمێک فێنکی عومرم
پێ ببەخشێ

کەمێک لەسەر زارت ناوم بهێنە
تا لە دەنگت گوێم لەخۆم بێ
وەرە ئێوارەی هەموو ئاسمان پڕ کە لە باڵەکانم

نەختێ شەو بمێنەرەوە
نەسیم تەڕ کە بە ئاوی چاوت

عیشقت فڕێبدەرە باوەشم
با تەنیایی ڕوو تێنەکا
چیدی هەنسکم تامەزرۆی بینینی
نائومێدی نەماوە
چیدی هەستم تاقەتی بڕینی
ماوەکانی وەسڵی گەڕانەوەی نەماوە
لە گۆشەکانی ڕۆحمەوە دەستپێبکە
لە پێڵوی کاتمەوە دەستم لێبدە
لە تکای گەردن و گوڕییمەوە گڕ بگرە
وەرە سەفەری هەموو خەونەکان
لەتەوقی سەری هیواکانەوە لێبکەرەوە
لە نوکی پێی یادگارییەکانەوە دەستپێبکە
لە شەوقی ئازارمەوە سارێژم بکە
لە ئاوی تراویلکەی ئەو حەزانەوە

بمشۆرەوە...

بمشۆرەوە ...

بەو ئاوەی کە باران و فرمێسک لێی پاک نابنەوە.

٢٠٠٧/١٠/٢٩

ساندهۆڵم

## هەرەسی نامەی حەز

لە کێڵگە بەفرینەکانی سات
هەرەسێک دەخزێتە نێو ناخی گەرمی خاک
ڕاڕەوی ئەم ئەسرینە چ ڕێگایەکی بێ کۆتایە...؟
چ هەسارەیەک لە شۆخیی ئاسمان هەڵدەکشێ و
چ ئەوینێکی خوێناوی لە ئەستێرەکان ئەتکێ..؟
چ مەرگێک چاوەڕێی پەنجە و لێوە شەرابییەکانە؟

هەمووومان بەرەو خەمی خۆمان خل دەبینەوە
گریانەکان کۆ دەکەینەوە

سەرمان لە پەتی کات ئاڵاندووە
حەزمان لەگەڵ کارەسات دووانە بووە
دڵمان لە زەبری شەوانی بێ چارە هەڵواسیوە
گوڵمان بە قەدی دڕکاوی ڕۆژگارەکان ناسیوە

هزری چ ماچێک خەواڵوی حەزێک دەبێ؟
چ ئەفسوسێک بەر لە داکشانی زەوی دەکێشرێ؟
شانەی چ پرچێ لە قیژەی بەیانیان گیردەبێ؟

چەکەرەی سەراب سەر دەکەوێ
حەزی هێزێک بۆ ڕاوەشان
هێزی حەزێک بۆ تێڕامان.....
گەردوون ئەسپ سوارێکی دۆڕاوە
لە تاودانی ڕێگاکان دەکەوێ
هەورە پەشمەکییەکان چیتر خواستی باران
بەجێناهێنن
چیتر حەز بە تەڕبوونی زەوی ناکەن

ئاو دەبێتە خوێن
خوێن سورتر دەبێ
لەسەر دیوارە سپییەکانی ناخ ڕەشیی دەنوسرێ
پەنجەرە ئاوییەکانی ئەوین دەشکێن
لەمەچەکی ئێوارەیەک ژیاننامەیەک نوقم دەبێ
هەرەس نامەیەک دێتە نوسین

ئێوارەیەکی سڕ
سڕ تر لە شەختەی ژیانی زستانی جەلادێک
سوڕی ژیانی ماتەمێک دێتە ئارا
تەنها کەڵبە بریقەدارەکانی جەنگ لەبەردەم
لاشەمان دەبینرێ
بەمەرگمان شانازییەک تۆمار دەکرێ
لە ژیانمان نەخشەی جیهانێکی دڕکاوی
لە سەر جەستەی برینداریمان پێ نیشان دەدرێ

٢٠٠٧/٠٩/٣٠
نۆربرۆ ـ کۆپنهاگن

# لەچاوەڕوانی وەحشەت دا

لە چاوەڕوانی و وەحشەتێکی پڕ ئارامیدا
خۆم مت داوە
ڕێبوارێ لە هەوارم ناگوزەرێ
گورزێک لە (چاوەڕوانیی) بەرامبەر
نیگام دانیشتووە
کێڵگە بەفرینەکانی هەموو عومرم
تەنیا هەتاوێکی سەرشێتیش تیا هەڵناکا
من لە ئەسیریی تاوانێک بەند کراوم
تاوانێک مرۆڤەکانی پێش خۆم
منیان کردە سەر پشک
تا لە کۆتاییەکان نەبینرێن

کات تا دێت

یاری بەقژم دەکا

ڕۆژگار تا دێت بە ڕوخسارم پێدەکەنێ

سەمایەک لە بێ چارەییم لەسەر کۆشی

ناخم دەگەوزێ

بۆ وا هەست دەکەم کە ئەم گەردونە

لە دروست بوونی من لە خۆی پەشیمانە؟

٢٠٠٧/١٠/١٨

ساندهۆڵم

# هەڵهاتن

هەڵهاتنم مەرگەساتێک بوو
فێری هەناسەدانی کردم لە ناو ئاو
فێری فڕینی کردم بە دوو باڵێکی شکاو
فێری شیعر نووسینی کردم
بەچەند وشەیەکی دارِزاو

هەڵهاتنم گۆرانییەک نەبوو لە سەفەر
پەنجەرەیەک نەبوو لە ئومێدی
خەوێک نەبوو بۆ گێڕانەوە
هەڵهاتنم چەند پەڵە هەورێک بوو
لە پڕ ئەکەوتمە باران و لەناکاویش لە ئاسمان دیار

نەئەمام
بە هەڵهاتنم دونیا نەبووە لەتێ نان ،
ژیان نەبووە سەبەتەیەک ماسی ...
بۆ برسێتی هەژاران
بە هەڵهاتنم جەنگ کۆتایی نەهات و
چەقۆکان هێشتا لە ژێر ملی ڕووناکی دان
هەڵهاتنم دۆزینەوەی کیشوەرێک بوو لە نەمان

٢٠٠٧/١١/١٢
نۆربرۆ ـ کۆپنهاگن

# چەلۆ خەمناکەکان

لەو دیو کۆڵانەکانی عیفەتەوە...
لەم دیو ژوورە تەسکەکانی تەنیایی
هەموو خانمەکانی دونیا
گۆرانی بۆ دارستانەکانی وەحشەت دەچڕن
چەلۆ قورسەکانی ژیانیان خستۆتە سەر شان و
بەرەو سەکۆیەکی تری بینینی پیاوە
تێڕ نەبووەکان کەوتن

٢٠٠٧/١١/٢٦
کاسترۆ کافێ لە نۆربرۆ ـ کۆپنهاگن

# تەنیا... بسوتێ

بسوتێ ....
ئەی هەناسەی تورەی شەوانی بێ گەنجیم
بسوتێ ئەی هەڵاوی غروری ڕۆژانی بێ یادگاریم
تۆ لە کێڵگە بەفرینەکانی ناخم بسوتێ و
ببە بەو پووشە سپییانەی کە لە پەروانەی
ئاشە هەواییەکانی ڕۆحم دەدەن ...
بسوتێ .... و لە سەرینە خەیاڵییەکانی هزرم
سەرخەوێکی شاعیرانە بشکێنە
ئەی لەزەتی ماچی ئێواران بسوتێ
ببە بەو باڵدارە خەمگینەی کە لە سەر سنگی

هەراسانم  چاوەڕێی سەفەرێکی پڕ وەحشەتە

تۆ لەوێوە بسوتێ ...
تازە بوونی تۆ نییە دوای ئەو هەموو شەڕ و جەنگە
بێ مانایەنە
تازە بۆنی تۆ تەنها بۆن کروزە لە دوای سوتانی
ئەو هەموو گوڵە بەیبونانە ..

لە وێوە گڕ بگرە ..
لە باوەشە ساردەکانی حوزنەوە
لە ئامێزی زامداریی درەختە
کوژراوەکانی پایزەوە
لە قیژەی پرچی شەوێکی باراناویەوە
لە هاتنی دوا سەدای ماچێکی دوو خۆشەویستەوە
تۆ خۆت بسوتێنە ....
بسوتێ ...
وەک پەڕاوی ئەو کتێبە کۆنانەی سەردەمی

نەفامیی ...

بسوتێ ...

وەک ئەو دارستانە بێ خاوەنانەی کات...

وک گەردەلولێک گڕ وەردە ئەم لاشانەی هەستم

ڕەش و پڕ سووتو بکە

بسوتێ بەڵام داوی خۆت بە هێمنی ئەم هەرێمە

ئاشوبەی خەمم

بۆ بخنکێنە لە دووکەڵی یادەکانت ...

بسوتێرەوە و جارێکی تر مەبە بەشنە بای

خەونەکان

بسوتێرەوە و چیدی منیش نابمە ئەو چاوەڕوانەی

کە بەتەمای هێمنیی چاوی دەریایە

بسوتێ...

دەست بە سەر دڵم دانێ و چاوت بنوقێنە...

سرودێکی مناڵیی بەدەم خۆتەوە بڵێ....

دەست بەسەر دڵی منەوە بگرە....

لەگیرفانی دڵەڕاوکێیمدا دەنکە شقارتەیەکی بێ ئومێد دەربینە....

ئەی نەسوتاوی ئەم زەمەنە قەرەبروتە بسوتێ...

بسوتێ هەتا ئەتوانی ببە بە خۆڵەمێشیی خەونە ئاشتیەکانم

شەوانە دانە کۆنەکانی ئەژدەرەکانی

پێش خۆت بشۆ و

بەو ئاواتە بنوو کە سبەینێ مەراسیمی سوتانی نەریتی شەرم  لەبەردەم حەوشە کچکۆکەکەی گەردوون دەبێت

٢٠٠٧/١٢/١٢

بێلاهۆی ـ کۆپنهاگن

لەبەرەبەیانێکدا جلی بوکێنیی(با) کانم تێر بۆن کرد....
ملوانکەی گوڵینی مەمکی (هەناسە) خستەوە نێو
ئینجانەی ماچەکانم.

# شەرابی سوور

پێشکەشە بە:

سپییێتی دڵی تارا جاف و

بە مەستیی تەلە ناسکەکانی هارپەکەی

من مەست و مەلولی شەرابم

من ژیانی سەرخۆشی شەوی شارم

منم خەونی بە باچوی کۆنە یار

من شەرمی لەزەتی ئێوارانم

من  ڕەنگی  گوڵی سووری دڵی ئەوم

منم شنە بای ڕۆژگاری نادیار

من مەست و مەلولی شەرابم
من تاقانەی تیشکی ڕۆحی سوتاوم
منم غەریبی ڕێگای ئەویندار

من شەوقی خوێنی خەیاڵم
من عیشقی سوری شەوانم
منم غەرقی پێکی لێوی یار

من مەست و مەلولی شەرابم
من بارانی باوەشێ ماچم
منم سۆراخی هەوری سپی سەفەر

٢٠٠٨/٠١/١٢
بێلاهۆی ـ کۆپنهاگن

# لەم هەرێمە

""ئەم سەکۆ هیلاکەی سەما جێرەهێڵم""

لەم هەرێمە پڕ لە چاوەڕوانیە
بۆ بۆنی دڵی تۆ دەگەڕێم
بۆ تۆ مەچەکم پڕ خۆڵ کردووە
پێم لەنێو تاشە بەرددا ،
تەشتی خوێنینم پڕ کردووە

لە سۆراخی وشەی (با) م
لە چاوەڕێی وێنەی تریشقیەکی هەورم
لە نیشتنەوەی بۆنی هەوای هیوام

لەهەموو کۆڵانەکانی دونیا
بۆ تۆ دەگەڕێم...
بە شوێن پێکانی تۆ دەگەڕێم و دەگریم
لە تەماشای ئەو هەموو خەڵکەم
بەڵکو ڕوخساری تۆ بێتە دەرەوە و
لە دیدی گزنگم وردبیتەوە

لەم هەرێمە
لەهەناسەکانی خۆت هەڵمبکێشە
من تا ئەم ساتەش لە کورسیەکی نێو ویستگەی
تەم ،
زیاترم نییە
من تا ئەم ساتەش لە چاوشارکێی ئەستێرەکان
هیچ یارییەکی منالیم بیر نەماوە

٢٠٠٨/٠١/١٥
فردریێکسبێرگ

# شەوانی (کۆپنهاگن)

شەوانی (کۆپنهاگن) هێمن و سادە
پەرییە ئاسمانییەکان خۆیان دەنوسێنن
بەسەر پردە هەڵواسراوەکانی هەوا

شەوانی (کۆپنهاگن) پڕ هەور و تەم
دەریاچە بچوکەکان خەونێکن
پڕن لە هەناسەی ڕێبواران

شەوانی (کۆپنهاگن) ....
دڵێکە لە شێوازی خەون
ڕیتمێکە لە جیاوزی

لە کۆڵانەکانی....

لە مەیدانەکانی...

لە جادەی پیادەکانی...

لە لای پەیکەری نوسەر و شۆڕشگێڕانەکانی...

لە بەردەم پەرلەمان و

لە حەوشەی کەنیسەکانی....

تەواوی خەڵک لە گەڵ تەم بونەتە عاشق

باوەشیان بۆ بارانی یەکدی کردۆتەوە و

هۆگری چریکەی یەک بروسکەی ماچن.

٢٠٠٨/٠٢/٠٩

بێلا هۆی ـ کۆپنهاگن

# سوریالیە ئەم گەردە

(١)

لەم جیهانە شورای تەل

دەوروو پشتمی تەنیوە

لە تووکی جەستەم بێزارم

لە نووکی پێم یاخیم

(٢)

لە فەزای ئاسمان ....

لە کۆترەکان دەپاڕێمەوە

لە سەر مانگ ...

دوکەڵ بە گەشتیارەکان دەفرۆشم
ئەو شەوە کەسێک لەسەر زەوی پێی وتم :
" کردنەوەی پیتزایەکی خڕ ئاسانترە یان
نوسینی شیعرێک ؟ "

(٣)

کە  مانگ پشتی دانەواند
پارچەیەک تەپووتۆز لە لەشی پڕ سۆزی
بەدەرکەوت !!

٢٠٠٨/٠٣/٠٥
کتێبخانەی شاژنی دانمارک ـ کۆپنهاگن

# بۆ شیعر

سوپاس ئەی شیعر
کە لە مەغریبی خۆشەویستیدا
باڵێکی پڕ فڕینیت بەرەو جریوەی ژیان و
ئومێدی باخێکیت بۆ هەناسەی جێی ژوان

سوپاس ئەی شیعر
کە لە سەحوەی تاریکیدا
تاڵێکی ڕوناکی باریک بویت و
لە کۆتاییەکاندا ئاسمانێکی بێ شەرم بوویت
بۆ مانەوەی سینگی دڵداران

٢٠٠٨/٠٤/٢٨
هیلسینگۆر

# وشکەساڵی

ڕۆژگاری تاریک
وەک شەو باریک

وشە بێ مانا
وەک گوڵ پەڕی ڕەش لەشەڕ دا

ئەم درۆ
وەک درۆی باران

ڕۆح بەتاڵە لەزیکر
وەک جەستە، تەنیا لە هزر

سیمای سوتاوی ماچ
وەک چەمانی بەژنی گوڵە گەنم

ڕووت بونەوە وشکەساڵییە
وەک ئامێزی دوو دڵدار
هەپرونی فڕێنێکە
بەسەر تەرمی ماچ

میوەی عیشق
وەک خاک تۆراوە
خوناوی سەفەر
وەک دارەکان زیندانە

سەمای پیرۆزی گەڵاکان
وەک هەڵوەرینی هیواکان

گاز گرتنی هەوا
وەک فرمێسکی هەور

پرسەی خوێنی کات
وەک کۆکینی شیعر

ئیفلیجیی وێنە
وەک کەرتبوونی زەوی

وشکەساڵی ڕووت بونەوەیە
هەرێمی بێ ئاسۆیە
وەک دابڕانی بەرەبەیانەکانە
ڕژانی پێکی شەوە درەنگەکانە
وەک بەد مەست بێ سەرسامە

خۆر بێ ورە
وەک ڕێگا نابینا

دڵ بێ نور
وەک گڵ بێ ڕوو

ژوور بێ بخور
وەک نیشانەی مەرگ

بێ خەونیی
وەک کەپرێک لە چاوەڕوانی

هەتاو گڕ
وەک کزیی ئاسمان

ئاوێنە قوڕ

گڵ ڕەق
دڵ بە پەت
خناکنی ماسییەکان لە ئاو
وەک مانەوەی سیحری تراویلکەی بیابانە
وشکە ساڵیی ڕووت بوونە لەبەردەم خوا
وشکە ساڵیی حیجابی بارانە لەبەردەم سەرکێشی
شاردا

٢٠٠٨/٠٤/٢٨
هۆرسهۆڵم ـ دانیمارک

# لە پێناوی بێ چارەییم

خەون بەداهاتووی کۆترەکان دەبینم
لەسەر سنگی کەشتییە نەگەیشتووەکان
سورمەی ئاڵتونیی کیژەکان کۆدەکەمەوە

بۆ لەمەودوا چیتر ڕووناکی دەربەندەکان
وێڵم ناکا کە بەدوای ئاوایی بکەوم....

خۆرم لەسەر شانم داگرت.. ،
چاوی نوقاوی ئاسمانیشم کردەوە

بەروارەکان نا نووسمەوە ...،

خولەکەکانیش لەژێر جادەی چاوەڕوانی دەنێژم ...

تابلۆی ماچەکان لە دیواری
تەڕی لێوەکان لێدەکەمەوە
بەرووەو نهێنییەکی ئاڵتر ئەیانگیرسێنمەوە
دیسان ئەڕۆم......
بۆ ئەوەی پشکۆی عیشقێ
وەک فرمێسک نەمسوتێنێ
دیسان ئەنووم...
بۆ ئەوەی خۆم و شیعر و تاراوگە لە خاچ
نەدرێینەوە.

٢٠٠٨/٠٥/٠٣
ئۆفلۆین ـ کۆپنهاگن

# یاخی و شیعر و ئاسن

ئەی دۆست
من گورگی ئەم دەڤەرە پڕ چەکە نیم
من جاسوسی دوپشکە ڕەشەکانی
سەردەمی لەزەت نیم
من قامچی لێدەری جەلادەکانی شەهوت نیم

ئەی دۆست
من سوتێنەری ئەو کوورە دڵ ڕەقەی زەمەن نیم
من زەلیلکەری عەشقە داماوەکانی موحیبەت نیم

من خەندەقی کینە نیم.....

من دوای کوشتنی نائومێدی
هێشتا مووچوڕکەکانم ناژمێردرێن

من نزیک ئاسن نیم ،
بە تەریبی هیچ ژەنگێکەوە نیم

چەپڵەی نابینایەک نیم

من یاخیی شێتییم، هاوڕێ

"یاخیبوون ئەوەیە کە تۆ بتوانی بفڕی
کاتێک هەموو کەس خۆی بە ماشێن خەریک کردووە
بتوانی دەست لەمانگ بدەی کاتێک هەموو کەس لەزەوی ئەژی"

من نزیک ئاسن نیم و

## تەنهاییم شیعرە

ئەوە شیعرە،،،،
ئەوە شیعرە ....
نە خۆرە نە ئاسمان
نە کازیوەی بەیان
نە ئێوارەی مەلەکان
شیعرە.... ئەوە شیعرە
شیعری ئێوارەی سەرخۆشێک
وشەی تەنهایەک لە حەشاماتیٚ کەسانی بزێو
شیعرە .... ئەوە شیعرە
هاوڕیٚ .....
ئەم ڕۆژگارانەی من شیعر ئەیبا بەڕێوە

ئەی دۆست کەمێک وەرە خوارەوە
با مانگ ببینم....

چاوەڕێم بکە لەسەر مانگ
لەلای کۆڵانی تەپوتۆزی خەیاڵەوە
لەپشت خوێندنگەی شەرمی دڵەوە
ئەتوانی بێیت یاخی بوون و شیعرم لێبسەنیت
و کلێلێکی خەونم پێبدەیت..؟

٢٠٠٨/٠٥/١٠
ئۆفلۆین ـ کۆپنهاگن

# سەرابی خەونە

ئەو پێی وتم تۆ لە خەون دەژیت ...!

هەموو ژیانت پێکهاتەیەکی  خەونە ...

تۆ لەسەردەمی ئێمە ناژیت چەند ئایەتێکی لە ئاو ...

نامەیەکی لە خەیاڵ ...

گفتوگۆیەکی لە بینینی دەنگ ...

ئەو دەیوت تۆ چاڵێکی نهێنیی بیابانیت لەسەر مانگ..!

کۆترێکی بۆریت ، قاچەکانت بە تەلی دڕکاوی بەندکراوە ...

بەڵام هێشتا دەفڕیت

ئەو هەمیشە پێی ئەوتم تۆ لە خەونێکی قەرسیلەیی دەژیت...
گیا لەگەڵ هەناسەکانی تۆ دێتە جوڵە
زەوییە گەنمەکانی ژن بە شیعری تۆ دەدورێتەوە.

بۆی نوسیم کە چاوە زەقەکانی ئەم سەردەمە
لە شمشاڵ ژەنەکانی (شنەی با) سور کردووە.
بۆی نوسیم کە گورگە ڕەشەکانی
ئەم مەرگە ساتە
هەڕەشەیان لە شوانی وشەکان کردووە .
داواکار بوو کە ببمە هەڵاوی
خەونێکی وەنەوشەیی و
بە جەستەی ئەم زەوییە بنوسێم ....
پێشنیازی ئەوەی بۆ کردم
کە چیدی لەسەر ڕۆخی
دەریا مردووەکان دانەنیشم و
لە قاقاکانی وەحشییەکان هەڵبێم و

لە بۆن ساردی هەناسەی دەمی کاولکارەکان
دووربکەومەوە.

بەرەوڕوو پێی وتم ...
تۆ لەگەڵ گوڵ بۆن دەگری و
شورای هەتاوێکی وشەی شەوگارەکانیت

پێی وتم ..
تۆ هەنسکی باخیت ...
نەک ئەسرینی شاخ
تۆ دڵی دەرهاتووی نەختێک ئێوارەی ...
نەک کلوی بەفری ساتە گەرمەکان
تۆ ئاوێنەی دەریاچەی ڕاکشانیت
نەک پەخشانی شەرمی شەوانی ڕامووسان

٢٠٠٨/٠٥/٢٦
سەنتەری کەلتوریی جیهان ـ کۆپینهاگن

# ئاشوبی تراویلکەی تەلیسم

ئاشوب
کەس لەم دێرە ئاشوبانەی زەمەنی ونبوو ناگات
کەس لەم  بێ قیژەیەی هەور نارِوانێ
هەمووی خەریکی هەڵکوڵینی ڕقە لەسەر وشکانی

......................‌‌

بەسەرهاتی ئەم خەونە ناگێڕێتەوە
ئەم خەونە لە هیچ ناچێت
نەلە ئاو نە لە هەوا نە لە بەرد نە لە گوڵ
هەموو خەونێک ئاشوبی وەهمێکە

## تراویلکە

گۆشەیەکی تەنیا

پڕە وەک تاریکی

گەردێکی شەوان

وردە وەک باران

سەرمایەکی یاخیە

توشی تێک شکان دەبێ وەک شەختە

## تەلیسم

منی یاخی ...

ئاوێنە تەماشام ئەکا

منی گۆڕاو...

کاتژمێر لەدەستم ئەکا

منی بێ جێ

نیشتیمان فێری تاراوگەم دەکا

ئاوێنەم شکاند

کاتم وەستاند

ژوورەکانم پڕ کرد لەخەم

٢٠٠٨/٠٢/٠٨

٢٠٠٨/٠٥/٢٦

**بێلاهۆی ـ کۆپنهاگن**

# هێشتا نە هاتویتەتە دی

لە شێتی باران باش نەگەیشتی
لەو خورپە سەیرانەی دڵ نە هاتیتە ئاگا
لەو پەنجە گڕاویانە نەڕامایت...
کە پیانۆیان بۆ سەمای هاتنەوەت لێدەدا
تۆ خاڵیی بویت لە ئێوارە
پڕ بوویت لە بروسکەی بەیانیان
تۆ هێشتا لەخەونی من نەهاتبویتەتە دی
بەتاڵ بویت لە سیحری شیرینی شەوان
خامۆش بویت لە گڕی ڕامووسان
تۆ هێشتا لە گۆشتی خەونەکانم نە هاتویتەدی

٢٠٠٨/٠٥/٢٦
نۆربرۆ ـ کۆپنهاگن

# سڵاو لە باشیی دڵ

سڵاو ئەی باشیی دڵ
سەرەتای دروستبونەوەی هەموو شیعرم
من ئەتبینم ....
پەرییەکی بێ ئاسمان و بێ ماڵی

سڵاو ئەی هەناسەی گوڵ
یارمەتیم بدە  بە بۆن هەناسە بدەم
من ئەتبینم.....
پەروانەیەکی بێ وەرز و  بێ ساڵی

سڵاو ئەی قژی تەڕ

دەستی بارانت دەگرم
زەویم بۆ پڕکە لە باخی عیشقی سڕ
من ئەتبینم....
هەورێکی سپیت زریان نازانی

سڵاو ئەی هەنگاوی ورە
نزیک بەرەوە لە ڕوخانی دنیام
ڕێگاکانم بۆ نۆژەنکەرەوە لە پەرتەوازیی
من ئەتبینم...
ڕێگایەکی لە کەوتن و هەراسانی

٢٠٠٨/٠٥/٣٠
ئۆفلۆین ـ کۆپنهاگن

# هاو نانسی

*بۆ مانەوەی هەناسەی تۆ و شیعر ...*

*(نانسی فلوت) بە تۆ پێشکەشە*

ئەم هەتاوە بۆ تۆ دائەگیرسێ
ئاسمان بۆ تۆ فەرشی بەرینی ڕاخستووە
ڕەشەبا لە باتی تۆ تورە ئەبێت
ژیان لە بوونی تۆ پێوستی بە تۆیە

تۆ بۆ خۆت دورگەیەکی لە ڕاستی
کەشتییەکی لە خەون و سەفەر

ڕەزێکی لە شادیی...

منم شەڕانگێزی ساتەکان
ناتوانم تەبا بم لەگەڵ کات.....
ساتەکان گەمارۆم دەکەن
کاتژمێرەکانی زەمەن
لەیەخەو لە مەچەکم دا خێراتر دەمێننەوە
ناتوانم ئەو چرکانە پشت گوێ خەم
کە لە مەغریبی خۆشەویستیەکدا خۆی دا
بەکوشت

هەناسەی شیعرم...
ئەگەر کات نەبێ من و تۆ بەیەک ناگەین
ئەمەش شێتیەکەیە
ئەمەش شیوەنەکەیە
ئەی ئەمە شیوەن و شێتی نیە
کە من و تۆ بە یادگاری جارانەوە ئاڵاوین

من تۆ بە ڕۆحێکی یاخیانە
سەما لەگەڵ وشەی شەوانی پێش خەوتن
دەکەین..؟؟

تۆ هەناسەی خوای ئەو عیشقە یت
کە خەڵکانی تر ناوێرن باسی بکەن و ناپەرستن

بۆ ئەوەی تۆ لە شیعر بمێنی
من هەمووکاتێک لەبەردەم وێنکەت
بە هۆنراوە نووسراوەکانی سەر دەریا
نوێژت بۆ ئەکەم
دڵم لە سەرمانگ دەهێنمەوە
هەتا لە پەنای دڵت بەیەکەوە دەستماڵی ساماڵ
بگرین و
هەتا زەوەی هەیە بە یادگاری دابکوتین

٢٠٠٨/٠٥/٣٠
ئۆفلۆین ـ کۆپنهاگن

# چەند گرتەیەکی شیعری

قژی تەڕت...

قژت تەڕە؟؟

من دەمێکە ئاگام لە قژت نییە

ئێستاش پەڵەی هەور تیا لەدایک ئەبێ ؟

ئێستاش  نیشتەجێی مەملەکەتی ڕەشی قەترانیە؟

جەنجا یی

لەم جەنجاڵیە هەموییان سەرقاڵن...

پەلەیانە....

پەلەی مردنیانە

من پەلەی ئاسودەییم

### زەنگ

چاوەڕێی لێدانی زەنگی ڕێکەوتێکی مژدە بەخشم

هیوام بە منالّیی کاتەکان هەیە....

بۆ ئەوەی لە وەرزەکاندا خۆشەویستیم گەشە بکا

### ئۆفیس

تۆ لەو ئۆفیسە تەنهایت

کاغەزەکانت کۆبکەرەوە:

وەرە سەر دەریا سەیری هێمنی ئاو بکە

قەڵەمەکت فڕێ بدە

بە هەتاو خۆت بشۆ

قژت با هەوا لێی بدا

من ئاوا ئەتبینم

### کەوتن

کەوتی؟

کەوتی لەسەر پشکۆی خۆر

بۆسەر تۆفانەکانی زەوی؟

## هەوا

بیری هەوا ئەکەم

وا هەست ئەکەم خەم هەناسە ئەدەم

من شەکلەمەی عیشقم پێیە

ئەخۆی؟

## دڵ

دڵت چۆن لێ ئەدا

بە ئاراستەی خۆر یان مانگ؟

دڵی من لەگەڕانەکانی پاشگەز بۆتەوە

بێ ئاڕاستەیە و بێ مۆڵگە

تەنها و تەنها بۆ کردنەوەی دەرگای عیشقێ لێ

ئەدا

٢٠٠٨/٠٦/١٤

بانفلۆین ــ کۆپنهاگن

# تۆ هەتا من

(١)

تۆ لەتێ لە هەستی منیت

من ئەزانم لە جەستەت شیلە ئەبارێ

من ئەو ڕێیەتم کاتێک ونی

من لە پەنای گریانەکانتم

من بە هانای نەهامەتیەکانی تاراوگەکەتم

تۆ خەونی هەموو ئێوارانی بێ (مەی)یمیت

تۆ چەند ساڵێکیت لە بێدەنگی

سەدەیەکی لە جوانی

ساتێکی لە ئومێدیی

(٢)

بڕیارە شەوێک  من و تۆ بچینە سەر مانگ...

ئاهەنگێکی کۆن  بۆهەناسەکانمان بگێڕین

بڕیارە دەستی یەکتری بگرین ..

جلی عیشق لەجەستەمان لەبەرکەین

بڕیارە بە سەمای توانەوە

جێی مۆمەکانی تەمەن بکەینەوە

لەلایەک دڵمان ئەفڕێ و

لەلایەکی تر ئەبێ ئەو شەوە

هەناسەکانمان کپ بکەین و حەسرەتەکانمان

بۆ خۆمان و هەڵاوی ئاهەنگەکە بمێنێتەوە

٢٠٠٨/٠٦/١٥

بانفلۆین ــ کۆپنهاگن

# شەکراوی قەدەرەکان

*پێشکەشە بە هاوڕێی دێرینی شیعر و یادگارییەکانم ......،*
*(نانسی فلوت) بەتۆ پێشکەشە .*

قەدەرەکان وەک خۆت جوانن
(با) کان وەک خۆتن پڕن لە پێکەنینن
نەرمیی قژی ڕەشت  پەنجە تاساوەکان دەتوێنی
پەڕەی دڵی فڕینت  بە تامەزرۆوە گڵی زەوی دەجوڵێنی
خوا بە ناوی تۆ بە ماڵەکانمان پیاسە دەکا
دوو جووتە کۆتر بە هەناسەی تۆ باڵ دەگرن
ئاوابوونی خۆر لە ڕەنگی تۆ دەبێتە ئێوارە
مانگ لە سیمای پڕ ژیانی تۆ دا سەوز دەبێ

تۆ مەخلوقێکی بۆن خۆشی
تۆ دونیایەکی لە هەتاهەتایی
تۆ سەمایەکی لەسەر ئەستێرەی شادی

قەدەرەکان وەک خۆت جوانن
وەک زریانێکی بێ زیان ، کاتێک خۆشەویستی بباریێنێ
وەک بوومە لەرزەیەکی بێ ڕووخان ، کاتێک ناخی دوو
دڵ بهەژێنێ
تۆ ئاوا دێیت، کاتێک کارەسات بوونی نامێنێ
کاتێک مەرگەسات دەبێتە خۆش بەهات
کاتێک گۆڕستانەکان لە سەمای نووکی پێت
گۆرانی دەچڕن ...
کتێبەکان بە ناوی تۆ پێشکەش دەکرێن
هەر لە بەر تۆش دێنە خوێندن
هەناسەی ژێر چەرچەفەکانی ڕاموسان ،
پێغەمبەرەکان دێنێتە خوانی موشتو مڕی هەبوونیان
تۆ هەلهەلەیکی لە تەڕایی

تەزبیحێکی لە پاکیی
کۆشکێکی  ئاویت لە دەریا
هەورێکی قژ درێژی لە هەنگوینی (با)
قەدەرەکان وەک شیلەی بنی مەمکەکانت شیرینن
قەدرەکان وەک بۆنی گوڵاوی ڕەحمت پڕن لە دەماری ژیان
قەدەرەکان وەک دۆڵی ڕازەوەی نێو ڕانت تەڕن بۆ زەریاچەی مان

٢٠.٠٩.٢٠٠٨
ساندهۆڵم ـ دانیمارک

# خانمێک لە شەهوەتی (با)

*""پێشکەشە بە کاڤانی پایزێک ،*
*بە ڕێکپۆشیی ژنێک و بە بوێریی هاوارەکانی""*

ژنێک وەک خەونی نۆتەیەکی مۆسیقا ...
کەمانچەیەکی ڕووتە ، ئاوازەکانی زەمەن قاوەیی
کردووە
پێکەنینەکانی وەک ڕاکردنی منالێکن بەسەر پردێک
لە نوور
دەنگی پێڵاوە بەرزەکانی عیفەتی زەوی
بەسەمفۆنی دەکا

ئاوڕدانەوە شەهێنەکانی ، ڕێگا لە حەسرەتیی
ڕادەماڵێ
خانمێک دوو لەت ...:
لەتێک لەفڕینی ئەرخەوان و
لەتێک لە شەهوەتی (با)
پرچێکی گەرم , تاڵەکانی گوررزە تەزویەکن
بۆ پەنجە سارد و داخراوەکانی پەستیی

ژنێک بە قەت هەناسەی ماچ ئاهـ هەڵدەکێشێ
جریوەیەکە لە گەروی ئومێدی
بەدەم ئارەزووەکانی کات ناحەپەسێ
و لە پشت ئارایشتی ئاوێنەکان دەگوزەرێ !!

ژنێکی چاوەڕوان لە دورگە نادیارەکانی هەست
ئەزانێ بە باڵی شیعر بفڕێ
ئەزانێ چۆن لەباتی ڕەشەبا ببێتە جوڵەیەکی سەما

خانمێک هەموو عومری لە بەهار ئەچێ

و سینگی بێستانێکە لە تەبایی

دەستی کزە(با) بەرنادا

دژایەتی پشتی خۆر ناکا

لەگەڵ ماوەی نێوان ئاسمان و زەوی دەدوێ

خانمێک لە تارمایی ناترسێ

لەگەڵ بوێریی هەتاو هەڵدێ و

هەرگیز نهێنییەکانی ئالودەبوون بە باوەشکردن

ئاشکرا ناکا

خانمێک تازە دەربازبووە لە یارییە لێهاتوییەکانی

قەدەر

پشتی ڕووتی : قەڵای ئاڵتونیی سپێدەکانە و

شوشەیی جەستەی : مەلەکوتی باخچە بێ

کۆتاییەکانە

دڵی بە ئاسانی لە دەریا فڕێ نادا

خورپەکانی لە یەقینە و لە ڕووخساری هیوا

مسۆگەرەکان ئەڕوانێ

له تەم و هەناسەکانی ، وێنەی ڕووتبوونی خۆی
دەکێشێ
متمانە بە سەراب و تۆز و خۆڵ ناکا

خانمێک بە قژێکی بریقەداری بۆن خۆشەوە
بە هەڵاوی ئەسرینی چاویەوە ، ئاوریشمێک لە
پاکیی دروست دەکا
بە فیکرێکی ڕێک پۆشەوە ،
شیعر دەنووسێ ....
لە دەستنووسەکانی (کامۆ) و (نیرۆدا) و (مارکیز)
وە
پێداچونەوەیەکی نوێتر بەسەر بوون و ...،
جارنامەیەکی بە خورپە تر بۆ خۆشەویستی و
زەریا و تەنیایی ڕادەگەیێنێ

خانمێکە هەموو کتێبەکانی یاسای سەیرکردنی
مانگ ـ ی خوێندۆتەوە
هەموو دەستورەکانی ئێستا و عەدەمی پێیە

پەپولەیەک بەسەر سنگییەوە ئاڵاوە ،
داوای مافی مانەوەی ئەبەدی لێ دەکا،
ژنێکە نارِوانێتە نەفامیی ژەنگ
عیشق رِێکەوتی هەنگاوە مێینەکانێتی
یەکەم سرووەیەتی بۆ خۆشویستنی بۆنی پیاوێک
ئەو تەنها نایەوێ بانگی پیاوێکی سەرلێشێواو بکا
ئەیەوێ پەنجەرە سەیری بکا
و شوشە نەیشکێنێ و
قەدەریش نا هەمواری نەکا

ژنێکی مناڵ
بەرائەتی لە عەتر و رِەنگی لە شەراب
چرپەکانی لە کریستال و گۆناکانی لە میهر
فرمێسکەکانیشی لە ئاونگی شەرمی سیحر
رِەفتە رِنگ قەیفەکانی موحیبەت هەموو وەرزێ
گەردنی دەپارێزێ
خانمێک هەموو دیوارەکانی ناحەزیی

بە پەنجەی مناڵیی ، وێنەیان لەسەر دەکێشی
سکپڕترین هەوری شیعرە ،
کاتێک دەباریێ گوڵی سور لە سەربانەکانی ئیلهام
بەجێدێڵێ
خانمێکە دوودڵیی لە شیعر دەسڕێتەوە
گریانی وشەکانی بە هەوا نە بێ ژیر نابنەوە

ترس لە هەبوونی زوڵمەتی فانۆسەکانی مێژوو
دەردەهێنێ
مرواری لەززەت لە ژێر ڕەگ و لەناو زمانی
سنەوبەرکان دەچێنێت
ڕێگە بە ماسییە شینەکانی ئەوین دەدا
لەگەڵ هەورە پەمەییە پەشمەکییەکان بکەونە
جووت بوون
خانمێکە سپی سپی وەک دیوارە بەفرینەکانی
کڵێسەیەک
لە خوێنی سوتاوی بخوور ....

لە سەر عەرشی دوکەڵی جەستەیەکی گەڕۆک
دڵی پیاوێک لە مۆمەوە بۆ ئاو درووست دەکا

هەموو پێخەفی زەوی جێگای خەوێتی
هەموو سەوزایی پشوی چاوەکانێتی
لە شیرینیی سورمە هەڵوەریوەکانی سەر کوڵمی ،
چواردەوری خۆی مینرێژی خۆشەویستی دەکا

خانمێک هەموو بەیانییەک نامەیەک بۆ خوا
دەنووسێ
داوای چارەنووس و گەڕانەوەی شاعیرە بەفر
پۆشەکەی دەکا ....
هەموو ئێوارەیەک دەنکە هەناری سور
لە ڕۆمانسیەتی دارەکان هەڵدەوەرێنێ .....
بۆ نێو دەمی ئایەتە تامەزرۆییەکانی خۆی .

۲۰۰۹ / ۰۱/۱۷
سلێیلسە

# پێرست

# ئالان پەری

## ١٩٧٨





لەدایکبووی شاری سلێمانی ، سەرجەم خوێندنی هەر لەوێ تەواو کردووە . خاوەنی ٣ کۆ شیعرە بەزمانی عەرەبی (مەملەکەتی خۆشەویستی) ١٩٩٩ (پێش کۆتاییم) ٢٠٠١ (ڕەشەباکان دیوارەکان پیر دەکەن) ٢٠٠٥ . بەشداری چەندین کۆڕی شیعری بووە و چەندین بەرهەم و نوسینی هەیە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی کوردستان. لە ساڵی ١٩٩٩ لە تاراوگە دەژی و لەوێش بەشداری چەندین کۆڕ و هەفتەی کەلتوری کوردی بووە. ئەندامی ڕێکخراوی PENی نێودەوڵەتی و PEN ی دانیمارکیە بەشداری چەندین چالاکی شیعری تایبەت بووە کە Danish PEN بۆی سازداوە و خاوەنی چەند شیعرێکە بەزمانی دانیمارکی. نووسین و سیناریۆیی بۆ کورتە فیلمی (تاراوگەی حەزەکان) ئامادەکردووە .